ناوی کتێب: پایەکانی ئیسلام بۆ منداڵان
نـاوی نووسـەر: ســـالار عــومــەر
هــەڵــەچــن : ئــاســیا حـســێن
دیزاینی تێکست: زەردەشـت کاوانــی
دیزاینی بــەرگ: ڕێــدار عــومـــەر
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٢
تیــراژ: (١٠٠٠) دانـــە

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٣٨٨)ـی ساڵی (٢٠٢٢)ـی پێ دراوە.

# پێشکەشەبە

مناڵەکانم

پێشکەشەبە خێزانی خۆشەویستم.

بەهەموو مناڵە خۆشەویستەکان.

بە هەموو ئەو کەسانەی یارمەتیدەر و هاوکارم

بوونە بۆ کاری خێر بەتایبەت.



# بەر لە دەست پێك

پێش ئەوەی دەست بەخوێندنی وانەكانمان بكەین دەبێ ئەم چەند پرسیارە بزانین:

## یەكەم: الله كێیە؟

لەوەڵامدا دەڵێین: الله ئەوزاتەیە كە هەموو بوونەوەری دروست كردووە و تاك و تەنهایە و ناخوات و ناخواتەوە و ناخەوێ و بێ ئاگا نابێ و ماندوو نابێت، هەموو كارەكان لەدەستی خۆیەتی و ئێمەش هەموو بەندەی ئەوین و ژیان و مردنمان لەدەستی ئەوە و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە.

## دووەم: محمد كێیە؟

محمد نێردراوی خوایە و كۆتا پێغەمبەرە كە الله (خوا) بۆ مرۆڤەكان ناردویێتی، تا ڕێگای ڕاست و ڕەوان بە مرۆڤەكان نیشان بدات ئەویش لەڕێگەی قورئانەوە.



## سێ یەم: قورئان چییە؟

قورئان: وتەی الله(خوا)یەو دابەزێنراوە بۆ پێغەمبەرﷺ، کەواتە قورئان دروستکراوی پێغەمبەر ﷺ نییە.

قورئان سەرچاوەی یەکەمی شەریعەتی ئیسلامە، پاشان کردەوەکان و وتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دێت و لەسەر موسڵمان پێویستە باوەڕی تەواویان پێ هەبێ .

## چوارەم: موسڵمان کێیە و دەبێ باوەڕی چۆن بێت ؟

**موسڵمان:** ئەوکەسەیە باوەڕی تەواوی بە الله و بەدینی ئیسلام هەیە.

موسڵمان دەبێ باوەڕی وابێ کە تەنها الله بپەرستێ و فەرمانەکانی جێبەجێ بکات، هەروەها باوەڕی وابێت کە محمد دوایین نێردراوی الله ( خوا)یە و دەبێ شوێنی بکەوێت و گوێڕایەڵی بێت و هیچ کەسێکی تر بە شوێن گرەوەی پێغەمبەری خودا نەزانێت و شوێنی نەکەوێت.

بۆیە لەسەر موسڵمانان پێویستە خۆیان شارەزابکەن لەدینی ئیسلام و الله ( خوا) بناسن و پێغەمبەرەکەی بناسن.

سالار عومەر - ٢٠٢٢/٣/٢١




# ئیســـــلام چـــــییه ؟

ئیسلام ئەو ئاینه پاك و بێگەردەیه كه لەلایەن الله وه نێرداوه بۆمان، لەڕێگەی پێغەمبەرەكەیەوه بۆئەوەی ئاگادارمان بكاتەوه له فەرمانەكانی خۆی تا ئێمەی مرۆڤیش گوێڕایەڵ بین و سەرپێچی نەكەین.

پێناسەی ئیسلام: هو الاستسلام لله بالتوحيد والانقياد له بالطاعة والبراءة من الشرك وأهله[1]

واته: بریتییه له خۆدانادەست الله به بەتاكدانانی و، ملكەچ بوونیەتی بەگوێڕایەڵ بوونی و، خۆبەری كردن لەهاوەڵدانان و هاوەڵدانەران.

---

(١) [الأصول الثلاثة]

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ )[(١)]واتە: بەڵێ هەر كەسێك خۆی تەسلیمی خوای گەورە كردبێت و بە ئیخڵاص و دڵسۆزی و نیازپاكی كردەوەی چاكی كردبێت وە موافقی شەرع بێت و لەسەر سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت ئەوا خوای گەورە لێی وەردەگرێت و قەبوڵی دەكات و ئەجرو پاداشتی لای خوای گەورە هەیە، كە مردیشن هیچ ترسێكیان لەسەر نیە بۆ داهاتوو، وە خەفەتیش ناخۆن لە ڕابردوو لە دونیا چونكە خوای گەورە باشتریان پێ دەبەخشێت.

---

(١) البقرة ١١٢




# ڕووکنەکانی ئیسلام

## بنەماو ڕووکنەکانی ئیسلام چین؟

بنەماکانی ئیسلام پێنج ڕوکنی بنەڕەتین کە بەڕووکنەکانی ئیسلام ناو دەبرێن، موسڵمان باوەڕی پێیەتی و ئیشی پێ دەکات و وازی لێ ناهێنێت.



پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (( بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ ))[١]

واتە: ئیسلام لەسەر پێنج بنەما بنیاتنراوە، شایەتوومانی هیچ خوایەك نیەشایستەی پەرستن بێت جگە لەالله، محەمەدیش ﷺ نێردراوی اللەیە، نوێژکردن و زەکات دان و حەج و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

(١) [البخاري : ٨]







# ڕووكنی یەكەمی ئیسلام:
## گەواهیدان (شایەتمان)ی
## (لاالەالاالله محمدرسول الله)

شایەتمان ڕووكنی یەكەمی ئیسلام و گرنگترینیانە، ئەو كلیلەیە مرۆڤ پێی دەچێتە ناو بازنەی ئیسلامەوە.

**شایەتمان دەكەینە دوو بەش:**

**یەكەم:** گەواهیدان (شایەتمان)ی ( لاالەالاالله).

**دووەم:** گەواهیدان (شایەتمان)ی (محمد رسول الله).

### یەكەم: بەشی یەكەم: شایەتوومانی لاالەالاالله:

لامعبود بحق الاالله (هیچ شتێك شایستەی پەرستن نییە بەحەق تەنها الله نەبێت)

بەشی یەكەمی گەواهیدان (لا إله إلا اللـــە) یەو بە وشەی (التوحید-یەكخواپەرستی) ناودەبرێت، كە مانای ئەوەیە كاتێك

مرۆڤ بە زمانی دەیڵێت لەهەمان کاتدا بە دڵی بڕیار دەدات و بەکردەوەش جێبەجێی دەکات، کە (هیچ پەرستراوێك نیە شایانی پەرستن بێت و پەرستنی ڕەوا بێت تەنها الله نەبێت ( لا اله: واتە هیچ خودایەك نیە حەق بێت ، الا الله: جگە لە الله ).

شایەتوومان بنەمای هەموو شتێکە بۆ موسڵمان کە هەموو باوەڕ دەگرێتەوە، بە بێ ئەو هیچ ئیشێکی موسڵمان ڕاست نابێت و پاداشتی لەسەر وەرناگرێت و نە نوێژ و نە ڕۆژوو ڕاست نابن بە بێ هاتنەدی ئەسڵی ئەو باوەڕەی لەشایەتوومان‌دا هەیە، وەك خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: «فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَاكُمْ»[١]واتە: ئەی مرۆڤ!! دەی کەواتە چاك بزانەو دڵنیابە جگەلەخوا، هیچ خوایەکی ترنیە، داوای لێخۆشبوونی گوناە بۆ خۆت و ئیمانداران لەپیاوان و ئافرەتان هەر لەو بکەو دڵنیابە کەخوا دەزانێت لەرۆژدا بەچی یەوە خەریکن و، لەشەویشدا لەکوێ دەحەوێنەوە و ئارام دەگرن، یاخود دەزانێت چی دەکەن لەدونیاداو، دەرەنجامەکەشی لەقیامەتدا چۆنە.

(١) (محمد: ١٩)




## پرسیار / شایەتمانی (لا اله الا الله) واتا چی؟

**بە ڕوونی ئەم وتەیە لە دوو بەش پێکهاتووە:**

**بەشی یەکەم:** لا إله/ هیچ پەرستراوێکی بەحەق و شایستە نییە.

واتە: هیچ پەرستراوێك نییە کە شایستەی ئەوە بێت پەرستشی بۆ ئەنجام بدەیت.

وە ئەم بەشە پێی دەڵێن: (نەفی کردن).

چونکە: تۆ نەفی هەموو پەرستراوێکی تر دەکەیت، وەك: (پەیکەر - دار - بەرد- گۆڕ ... هتد).

**بەشی دووەم:** إلا الله/ واتە: بێجگە لە (الله)

واتە (الله) بە تەنها شایستەی پەرستنە: چونکە: ئەو بەدیهێناویت و ڕزق و ڕۆزیت دەدات و ژیان و مردنی تۆی بەدەستە.

وە بەم بەشە دەڵێن: (جێگیر کردن).

چونکە: تۆ جێگیری دەکەیت کە (الله) پەروەردگاری شایستەیە، وە پەرستراوەکانی تر بەتاڵن.

بەڵگە:

(ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ هُوَ الْبَاطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ )[١]واتە: بەڕاستی خوا خۆی حەق و ڕاستە، ئەوانەش کە ئەوان جگەلەو هانا و هاواری بۆ دەبەن، هەر ئەوە خۆی بەتاڵ و ناحەقییە. بێگومان ئەو خوایە بڵند و بەرز و مەزن و گەورەیە.

(وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا)[٢] واتە: (ئەی خەڵکینە) تەنها خوا بپەرستن و هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن.

(وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ)[٣] واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لە ناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا نێردراوێکمان ڕەوانە کردووە و پێمان ڕاگەیاندووە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر.

(وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)[٤] واتە: بێگومان من پەری و جنۆکە و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.

---

(١) الْكَبِيرُ [الحج٦٢]

(٢) [النساء:٣٦]

(٣) [النحل:٣٦]

(٤) [الذاريات:٥٦]





﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ﴾[1] واتە: فەرمانیشتان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە خوا پەرستی بکەن و بە پاکی و دڵسۆزی و ملکەچی فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکە بن و لابدەن لە هەموو ئاینێك و تەنها پابەندی ئاینی ئیسلام بن»

(١) [البينة:٥]




## بەشی دووەم: گەواهیدان (شایەتوومان)ی الاله‌الاالله

گەواهیدان بەتەنها بەس نییە بۆ موسڵمان بەڵکو دەبێ بزانێت (لا اله الا الله) چەند مەرجێکی هەیە تا جێبەجێیان بکات،ئەم مەرجانەش بریتین لە:

١- العلم: زانینی ماناکەی : خوای پەروەردگار دەفەرموێ : (فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ )[1] واتە : ( وە بزانە هیچ خودایەك نییە جگە لە (الله).

پێغەمبەر (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) دەفەرموێ: (من مات وهو يعلم انه لا اله الا الله دخل الجنة )[2] واتە : ( هەر کەسێ بمرێ وە بشزانێ کە هیچ پەرستراوێك نیە شایانی پەرستن بێ و حەق بێ تەنها الله نەبێ ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە ).

---

(١) محمد ١٩

(٢) پێشەوا موسلیم گێڕاوێتیەوە

**٢- الیقین: دڵنیابوون و دوودڵ نەبوون:** واتە هیچ گومانت لە دڵ نەبێ بەرامبەر ڕاستی و بە حەق زانینی لا اله الا الله خوای بەرز ئەفەرموێ: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا)[١] واتە: (بە دڵنیاییەوە بڕوادارانی ڕاستەقینە ئەوانەن کە بڕوایان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وعلی اله وسلم پاشان گومان و دوو دڵیان نیە لە بڕواکەیان ).

پێغەمبەر (صلی الله علیه وعلی اله وسلم) دەفەرموێ : (اشهد ان لا اله الا الله، وانى رسول الله لا يلقي الله بهما عبد غير شاك ، فيحجب عن الجنة )[٢]، واتە: (گەواهی ئەدەم بەوەی هیچ پەرستراوێك نیە حەق بێ تەنها الله نەبێ و، من نێردراوی خوام هەر بەندەیەك بەو شاهێدیە بگات بە خوا کە گومان و دوو دڵ نەبوبێ لێی ، ئەوە دوور ناخرێتەوەو ڕێی لێ ناگیرێ لە بەهەشت).

**٣-القبول: وەرگرتن و ڕازی بوون:** دەبێت ئەم وشەیە قبوڵ بکات و ڕازی بێت بە دڵ و زمان.

**٤- الانقیاد: ملکەچ بوون:** دەبێت ملکەج بێت و پابەند بێت بۆ لا إله إلا الله، دەبێت دەست بە قورئان و سونەتەوە بگرێت و خۆی

(١) الحجرات ١٥

(٢) پێشەوا موسلیم گێڕاوێتیەوە

بداتە دەستەوە بۆ خوای گەورە، خوای پەروەردگار دەفەرمویّ: ﴿ وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴾[١] واتە: (هەوڵ بدەن هەمیشەو بەردەوام دڵتان لای خوا بێت و بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگارتان و ملکەچی فەرمانەکانی بن، پێش ئەوەی کە سزای خوا یەخەتان بگرێت لەوەودواش سەرکەوتوو نابن کەس نابێت بەرگریتان لیّ بکات).

**٥- الصدق: دەبێت راستگۆ بێت:** ئەم وشەیە بڵێت بەڕاستگۆیی لەدڵی دەربچێت، پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویّ: (ما من أحد يشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا عبده ورسوله صدقا من قلبه إلا حرمه الله على النار)[٢] واتە: ( هەر کەسێك شاهێدی بدا بەوەی کە هیچ پەرستراوێك حەق نیە تەنها الله نەبیّ ، وە شاهێدی بدا بەوەی کە موحەممەد بەندەو نێردراوی خوایە بە ڕاستگۆیی لە دڵیەوە ئیللا خوا حەرامی دەکات لەسەر ئاگر) .

**٦- الإخلاص: دەبێت بەنیاز پاکی بۆ خوای گەورە بێت و بۆ ڕیا نەبێت:** پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمویّ: (أسعد الناس

(١) الزمر ٥٤

(٢) پێشەوا بوخاری بەژمارە ( ٢٨ )،موسلیم بەژمارە(٣٢) گێڕاوێتیانەوە

بشفاعتي من قال لا إله إلا الله خالصا من قلبه أو نفسه)[١] واته : (بەختەوەر ترین کەس بە تکای من لەڕۆژی قیامەت ئەو کەسەیە وتبێتی لا اله الا الله بە دڵسۆزی لە دڵیەوە یان لەناخییەوە) .

٧- **المحبة: خۆشەویستی:** دەبێت خۆشەویستی بۆ ئەم وشەیەی هەبێت و بۆ ئەوانەش کە ئەم وشەیە دەڵێن و موسڵمان و ئەهلی تەوحیدن(یەکخوا پەرستن).

٨- **کوفرکردن بەطاغوت:** واتە کوفرکردن بە هەرشتێك بێجگە لە الله بپەرسترێ .

قبوڵ کردن دژەکەی ڕەتکردنەوەیە، هەر کەسێك شتێك لە دین یان لە داواکارییەکانی (لا اله الا الله) ڕەت بکاتەوە، ئەوە (لا اله الا الله)یەکەی هەڵدەوەشێتەوە.

(١) پێشەوا بوخاری بەژمارە( ٩٩) گێڕاوێتییەوە




# کوفر کردن بە طاغوت

## طاغوت چییە؟

گشتگیرە لەهەموو شتێك بپەرسترێت جگە لە (الله)، هەموو شتێك بپەرسترێت جگە لە (الله) و ڕازی بێت بە بەپەرستنی بەندەیەك یان شوێنکەوتنی بەندەیەك یان شوێن کەوتوویەك، یان گوێڕایەڵ بوون لە جگە لە (الله) و نێردراوەکەی ئەوە طاغوتە.

## چەند جۆرێکی طاغوت:

**یەکەم:** طاغوتی پەرستن: هەموو شتێك دەگرێتەوە کە دەپەرسترێت جگە لە (الله) وەکو بت و گۆڕی پیاوچاکان و دار و بەرد وسە رکردەکان...تاد.

**دووەم:** طاغوتی حوکم: هەموو ئەو کەس و لایەنانە دەگرێتەوە کە حوکم بە شەریعەتی (الله) ناکەن یان دەیگۆڕن بە یاسایەکی تر .

**سێیەم:** طاغوتی شوێن کەوتن و گوێڕایەڵی: هەموو ئەو کەس و لایەنانە دەگرێتەوە کە خەڵکی شوێنیان دەکەون و گوێڕایەڵیان دەکەن لە هاوبەش دانان و بێ باوەڕی وە لە حەڵاڵ کردنی شتێك کە (الله) حەرامی کردووە یان حەرامکردنی شتێك کە (الله) حەڵاڵی کردووە.

**ئیبن قەییم (ڕەحمەتی اللەی لێ بێت) دەفەرموویت: گەورە تاغوتەکان پێنجن:**

١- شەیتان کە مرۆڤ بانگ دەکات بۆ گومڕایی و کوفر.

٢- هەر کەسێك ڕازی بێت خەڵکی بەندایەتی بۆی بکەن ئەوە تاغوتە.

٣- هەرکەسێك بانگەوازی بۆ ئەوە بکات کە غەیب دەزانێت ئەوە تاغووتە.

٤- هەرکەسێك بانگەوازی خەڵك بکات بۆ ئەوەی عیبادەتی بکەن، ئەوە تاغووتە کە ئەمە بیر و باوەڕی هەندێك لە سۆفییەکانە.

٥- هەر کەسێك حوکم بکات بە بێجگە لە حوکمی خوا ئەمە تاغوتە، ئەگەر:

- باوەڕی وابێت حوکمی بێجگە لە حوکمی خوا وەك حوکمی خوایە، ئەمە کوفری گەورەیە.

- باوەری وابێت حوکمی بێجگە لە حوکمی خوا باشترە لە حوکمی خوا ، ئەمە کوفری گەورەیە.

- باوەڕی وابێت حوکم کردن بە بێجگە لە هی خوا حەلالە (دروستە) ئەمە کوفری گەورەیە، چونکە هەر حەڕامێك حەڵاڵە بکەی یان بە پێچەوانەوە کوفری گەورەیە.

بەڵام ئەگەر حوکم بکات بە بێجگە لە قورئان و باوەڕی وابێت حوکمی خوا باشترین حوکمە، وە حەرامە حوکم بە بێجگە لە حوکمی خوا بکرێ، ئەمە تووشی کوفری گەورە نەبووە.




## بەشی یەکەم:
## گەواهیدان (شایەتوومان)ی
## محـــمد رسول الله ﷺ

لامتبوع بحق الا رسول الله (هیچ کەسێك شایستەی شوێن کەوتن نییە تەنها نێردراوی خوا ﷺ نەبێت)

موسڵمان دەبێت باوەڕی وابێت کە محمد ﷺ دوایین نێردراوی الله (خوا) یە و دەبێ شوێنی بکەوێت و گوێڕایەڵی بێت و هیچ کەسێکی تر بە شوێن گرەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ نەزانێت و شوێنی نەکەوێت).

باوەڕهێنانی تەواو بە پێغەمبەر ﷺ بەشێکی گرنگە لە باوەڕی موسوڵمان، چونکە باوەڕ بە الله و بە ئیسلام پەیوەستە بەو بەشە لەباوەڕ هێنان بە پێغەمبەر ﷺ و تەواوکەری شایەتی ”لا إله إلا الله“ یە.

## مانا و مەرجەکانی " محمد رسول الله " ﷺ چییە؟

مانای (محمد رسول الله ) بریتیە لەوەی دانبنێیت لە کردار و ناختدا بەوەی (محمد) ﷺ بەندەی خودایە و نێردراوی ئەوە بۆ خەڵکی بەتێکڕا.

## داخوازییەکانی چین؟

داخوازیەکانی بریتیە لە: گوێڕایەڵی کردنی لە فەرمانەکانیدا، وە بەڕاست خستنەوەی هەواڵەکانی و، دوور بکەویتەوە لەهەر شتێك ڕێگری لێکردووە، وە خواپەرستیەکەت بەگوێرەی سوننەتی پێغەمبەر بێ ﷺ .

## مەرجەکانی شایەتوومانی ( محمد رسول الله)ﷺ، بریتیە لە:

١- داننان بە پەیامەکەی، وە باوەڕ پێ بوونی لەناخەوە.

٢- وتنی ئەم ڕستەیەو، دانپێدانانی بەئاشکرا بەزمان. (ئەوە لە وڵاتی موسڵمانان، بەڵام حاڵەت هەیە هەندێکجار کەسەکە باوەڕەکەی ئاشکرا ناکات و دەیشارێتەوە ئەمەش لەبەر ئەوەی دەوروبەری بێباوەڕن و توشی کێشەی دەکەن).




٣- شوێنکەوتنی بەوەی کردار بکات بەو حــەقـەی هـێناویەتی، وازبهێنێت لەو کردارە ناحەقیانەی ڕێگری لێ کردووە .

٤- بەڕاست دانانی لەهەموو ئەو هەواڵانە غەیب و پەنهانیەی داویەتی سەبارەت بە ڕابردوو و داهاتوو.

٥- خۆشویستنی زیاتر لە خۆشوویستنی نەفس و ماڵ و منداڵ و هەموو خەڵکی .

٦- پێشخستنی وتەی ئەو بەسەر هەموو کەسێکدا، وە کردەوە کردن بە سوننەتەکانی .




# بەشی دووەم: شایەتوومانی
# (محـمد رســول الله)

### مافەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر باوەڕداران :

ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ فەزڵ و چاکەی زۆرە بەسەر باوەڕ دارانەوە بۆیە لە هەمان کاتیشدا مافی زۆری لەسەر موسڵمانان هەیە، لێرەدا هەوڵ دەدەین بە کورتی هەندێك لە مافەکانی ڕوون بکەینەوە :

**مافی یەکەم:** ناسینی پێغەمبەری خوا ﷺ.

**مافی دووەم:** باوەڕ بوون بە پێغەمبەری خوا ﷺ.

**مافی سێیەم:** بەڕاست دانانی ئەو هەواڵانەی کە دەیدات :

**مافی چوارەم:** گوێڕایەڵی کردن و شوێن کەوتنی لەو فەرمانانەیدا کە دەیدات .

**مافی پێنجەم:** دوورکەوتنەوە لەو شتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێ دەکات.

**مافی شەشەم:** گەڕانەوە بۆ حوکمی ئەو و ڕازی بوون پێی .

**مافی حەوتەم:** خوای پەروەردگار نەپەرستین تەنها لە ڕێگای پێغەمبەر ﷺ ەوە نەبێت.

**مافی هەشتەم:** بەگەورە دانانی و ڕێز لێ گرتنی .

**مافی نۆیەم:** خۆشویستنی پێغەمبەری خوا ﷺ .

**مافی دەیەم:** صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ .

**مافی یانزەیەم:** دانانی لەو پلەیەدا کەشایستەی خۆیەتی بە بێ زیادە ڕەوی و کورت ڕەوی.

**مافی دوانزەیەم:** گوێڕایەڵی و سەرخستنی.




## بەشی یەکەم: پایە و ئەرکانی دووەمی ئیسلام : نوێژکردن

ئیسلام پایەیەکی داوە بەنوێژ نەیداوە بە هیچ پەرستنێکی تر.

نوێژ یەکەم ئەرکە خوای گەورە فەرزی کردووە لە پەرستنەکان دا. نوێژ لە مەککە فەرزکرا لەکاتی (شەوڕەوی) ئیسراو میعراجداو، دووەم بنەمای ئیسلامە و فەرزە (پێویستە) لەسەر هەموو موسڵمانێکی ژن و پیاو ئەنجامی بدەن لەکاتی دیاری کراوی خۆیدا، وە پەروەردگار دەفەرموێت: (إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَوْقُوتًا )[١] واتە: چونکە بەڕاستی نوێژ لەسەر ئیماندااران فەرزە لەکاتی دیاریکراودا ئەنجام بدرێت.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمویت: (وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ)[٢] واتە: نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجامبدەن.

(١) النساء ( ١٠٣ )

(٢) البقرة ( ٤٣ )

نوێژ کۆڵەکەی ئاینە وهیچ پۆزشێك لەو کەسە وەرناگیرێت کە وازی لێ بهێنێت لە کاتێکدا لە توانایدا بێت ولەسەری بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی یەکەم شت مرۆڤ لێی دەپرسرێتەوە



لەسەری لە ڕۆژی دواییدا نوێژە، هێمای جیاکەرەوەی نێوان موسڵمان و بێباوەڕە،وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «إن بين الرجل وبين الشرك والكفر ترك الصلاة»[١]،واتە: لە نێوان پیاو(بۆ

(١) پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی کردووە

تەواوی موسڵمانان) ولە نێوان هاوەڵدانان وبێباوەڕیدا وازهێنان لە نوێژ هەیە.

هەروەها دەربارەی نوێژ لە چەند جێگەیەکدا لە قورئاندا باس کراوە: (قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ (١) الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ (١))[1]، واتە؛ بە ڕاستی ئەو بڕوادارانە سەرکەوتوو سەرفراز بوون* ئەوانەش ئەوانەن کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچ و دڵ ئارام و دڵ دامەزراون و دڵیان لای خوایە.

لە ئیسلامدا ڕۆژانە پێنج نوێژ فەڕزە لەسەر موسڵمانان، هەروەها چەند جۆرێکی تری نوێژ هەیە وەك: نوێژی جەژن و نوێژە بارانە و نوێژی مردوو و نوێژی خۆرگیران.

(١) المؤمنون






## بەشی دووەم:

## ڕووکنی دووەمی ئیسلام: نوێژکردن




### نوێـژە فـەڕزەکان :

ژمارەی نوێــژە فەڕزەکان لە شەو و ڕۆژیکدا پێنج نوێژە و هەموو ڕکاتەکانی ئەو پێنج نوێژە دەکەنە حــەڤدە (١٧) ڕکات لە شەو و ڕۆژێکدا.

١- نوێژی بەیانی، دوو ڕکاتە.

٢- نوێژی نیوەڕۆ (الظهر) چوار ڕکاتە.

٣- نوێژی دوانیوەڕۆ (العصر) چوار ڕکاتە.

٤- نوێژی شێوان - ئێوارە (المغرب) سێ ڕکاتە.

٥- نوێژی خەوتنان (العشاء) چوار ڕکاتە.

## مەرجـەکانی نوێــژ

**یەکەم:** ئیسلام، واتە ئەو کەسە دەبێت مسوڵمان بێت.

**دووەم:** عاقڵ بێ، واتە ئەو کەسە دەبێت عەقڵیشی هەبێت و لە ڕووی دەروونیەوە تەواو نەبن، چونکە بە هیچ شێوەیەك لەسەر کەسی ناتەواو نوێژکردن پێویست نیە.

**سێیەم:** بزانێت لە پاك و خاوێنی، واتە دەبێت پاك و خاوێنی جیا بکاتەوە.

**چوارەم:** پاکڕاگری، کە دەست نوێژ و خۆشتن و پاکڕاگرتنی جەستە و جل و جێگەی نوێژ ئەگرێتەوە.

**شەشەم:** داپۆشینی لاشە:

١- بۆ پیاوان: دەبێ لە ناوکەوە تا ئەژنۆی داپۆشێت و جلەکەی تەنك و تەسك نەبێت.

٢- بۆ ئافرەتان: دەبێ هەموو لاشەی داپپۆشێت جگە لەهەردوو دەستی و دەم و چاوی، وە جل و بەرگەکەشی نابێت تەسك و تەنك بێ. (پانتۆڵ و هاوشێوەکانی نەبێت).




**حەوتەم:** نوێژکردن لە کاتە دیاریکراوەکانی خۆیدا

**هەشتەم:** ڕووکردنە قیبلە.

**نۆیەم:** نییەت، سەرچاوەی لە دڵەوە گرتووەو ئەمەش بە خۆ ئامادەکردن و بە مەبەستەوە هەڵدەستێت بەو نوێژە.(گوتنی نیەت بەدەم ڕاست نییە و پێویست نییە).




# بەشی سێیەم:
# ڕووکنی دووەمی ئیسلام: نوێژکردن

بەر لەوەی باسی نوێژکردن و فێربوونی نوێژ بکەین، دەبێت سەرەتا باسی دەست نوێژ گرتن بکەین، چونکە بەبێ دەستنوێژ نوێژکردن قبوڵ نییە و وەرناگیرێت، وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: ( لا تُقْبَلُ صَلاةٌ بغيرِ طُهُورٍ )[1]

## باسی دەستنوێـژگرتن:

خوای گەورە فەرموویەتی: (إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ)[2] کاتێك ویستتان هەڵسن نوێژ بکەن ڕووخسارتان بشۆن و دەستتان تاکو ئانیشکتان بشۆن و سەرتان بسڕن(مەسح) بکەن و قاچتان تاکو قولەپێ (گۆزینگ)تان بشۆن.

(١) پێشەوا موسلیم بەژمارە ( ٢٢٤) گێڕاوێتییەوە.
(٢) المائدة (٦)




## پێویستییەکانی دەستنوێژ شەشن:

**یەکەم:** نیەت هێنان: لەدڵەوە نیەت دەهێنیت و نابێت بە زمان بگوترێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((اِنمَّا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ))[1] کردەوەکان بەپێی نییەتەکانە.

هیچ کردەوەیەك بەبێ نییەت وەرناگیرێت، پێویستە لەدڵەوە نیەتت هەبێتنیەتەکەشت بۆ الله بێت.

**دووەم:** چوونە سەر ئاو گەر پێویست بوو، نابێت بەبێ خۆ خاڵیکردنەوە دەست نوێژ بگیرێت، چونکە هۆکارێکە بۆ ئەوەی بەئاسوودەیی نوێژ بکەیت.



---

(١) رواه الشيخان

**سێیەم:** شۆردنی ڕووخسار: سنووری ڕوخسار: لە نێوان هەردوو گوێیە، تاکو کۆتایی مووی پێشە سەر تا کۆتایی چەناگە.

**چوارەم:** شۆردنی هەردوو

**دەستەکان** تاکو ئانیشکەکان:

**چوارەم:** سڕین (مەسح)ی سەر:

**پێنجەم:** شۆردنی هەردوو قاچەکانە تاکو قولەپێ (گۆزینگەکانی).

**شەشەم:** پێویستە بەڕیزبەندی ئەو هەنگاوانەی سەرەوە جێبەجێ بکرێت، یەك لەدوای یەك، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرە دەستنوێژی گرتووە.

## سوننەتەکانی دەستنوێژ دە سوننەتن:

**یەکەم:** گوتنی (بسم الله الرحمن الرحیم)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (توضئوا باسم الله)[1]، دەستنوێژ بگرن بەناوی (الله) و (بسم الله) بکەن.

**دووەم:** شۆردنی هەردوو لەپی دەست پێش ئەوەی بیانخاتە ناو ئاوەکە، ئینجا -لە دوای دەست شۆردن- سیواك بکات.

(١) رواه النسائي



**سێیەم:** ئاو لەدەم وەردان.

**چوارەم:** ئاو لە لووت وەردان.

**پێنجەم:** سڕین (مەسح)ی هەموو سەر.

**شەشەم:** سڕین (مەسح)ی هەردوو گوێیەکان بەپەنجەی دۆشاو مژە بۆ ناوەوەی گوێیەکان و پەنجەکانی تر لەدەرەوەی گوێ دەبن.

**حەوتەم:** هەڵگوشینی ڕیشێکی پڕە بە پەنجەی دەستی، هەروەها چەنگە ئاوێکیش بخاتە ژێر چەناگەی.

**هەشتەم:** پێشخستنی شۆردنی لای ڕاست ئینجا لای چەپ، پێغەمبەر ﷺ پێشخستنی لای ڕاستی پێخۆشبوو: لە دەستنوێژ و غوسڵ و سەرشانەکردن و پێڵاوکردنەپێ[١].

**نۆیەم:** شۆردن و سڕینی ئەندامەکان سێ جار سێ جار.(یەك جار ئەرکە)

**دەیەم:** ئەندامەکانی بە دوای یەکدا بشوات بە جۆرێکی وەها: یەکەمیان وشك نەبێتەوە کاتێ دەست بە دووەمیان دەکات.

دوای ئەوەی دەستنوێژت هەڵگرت ئەوکاتە دەتوانیت نوێژەکەت بکەیت، بەڵام دەبێ کاتی بانگ هاتبێت.

---

(١) رواه الشيخان




## بەشی چوارەم:

## ڕووکنی دووەمی ئیسلام : نوێژکردن

### بـانگ و مـانای بـانگ :



بـــانگ : الاذان لە زمانەوانیدا بەمانای ڕاگەیاندن و ئاگادارکردنەوە هاتووە .

لە شەرعیشدا بەمانای ڕاگەیاندن و ئاگادارکردنی موسڵمانان بەوەختی نوێژ هاتووە و بێژەگەلێکی تایبەت یان بەواتای (النــداء) بانگکردن بۆ نوێژ هاتووە .

### بانگ و مانــای وشەکانی بـانگ :

الله اكبر الله اكبر: (الله)گەورەترینە، (الله) گەورەترینە

اللەاکبراللەاکبر: اللە گەورەترینە، اللە گەورەترینە.

اشهد ان لا اله الا اللە : گەواهی دەدەم هیچ خوایەك بەحەق نییە ئیللا اللە نەبێ .

اشهد ان لا اله الا اللە : گەواهی دەدەم هیچ خوایەك بەحەق نییە ئیللا اللە نەبێ .

اشهد ان محمدا رسول اللە: گەواهی دەدەم کە محمد پێغەمبەری خودایە.

اشهد ان محمدا رسول اللە: گەواهی دەدەم کە محمد پێغەمبەری خودایە .

حي على الصلاة: وەرن بەرەو نوێژ .

حي على الصلاة: وەرن بەرەو نوێژ .

حي على الفلاح: وەرن بەرەو رزگاری .

حي على الفلاح: وەرن بەرەو رزگاری .

اللە اكبر اللە اكبر: اللە گەورەترینە ، اللە گەورەترینە .

لا اله الا اللە: هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە ئیللا اللە نەبێ .

## وەڵامـدانەوەی بـانگ:

سوننەتە لە کاتی بانگدا خۆمان بێدار بکەینەوە و وەڵامی بانگ بدەینەوە، بەم شێوازەی خوارەوە:

لە کاتێکدا بانگبێژ گوتی (أللهُ أكْبَرُ أللهُ أكْبَرُ) تۆیش لەدوایەوە هەمان شت دووپات بکەرەوە و بڵێ (أللهُ أكْبَرُ أللهُ أكْبَرُ). کە بانگبێژ گوتی (أشْهَدُ أنْ لاَ إلهَ إلّا اللَّهُ) تۆیش لەدوایەوە هەمان شت دووپات بکەرەوە و بڵێ (أشْهَدُ أنْ لاَ إلهَ إلّا اللَّهُ). کاتێك بانگبێژ گوتی (أشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّه) تۆیش لەدوایەوە هەمان شت دووپات بکەرەوە و بڵێ (أشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّه). کاتێك گوتی (حَيَّ عَلَى الصَّلاة) سوننەتە تۆش بڵێیت (لاحول ولا قوة الا بالله). وە کاتێکیش گوتی (حَيَّ عَلَى الفَلاحِ) ئەوا تۆش بڵێ (لاحول ولا قوة الا بالله). وەکاتێك بانگبێژ گوتی (أللهُ أكْبَرُ أللهُ أكْبَرُ) ئەوا تۆش وێنەی ئەو دووپات بکەرەوە و بڵێ (أللهُ أكْبَرُ أللهُ أكْبَرُ). وەکاتێك بانگبێژ گوتی(لا إلهَ إلّا اللَّهُ) ئەوا تۆش وێنەی ئەو دووپات بکەرەوە و بڵێ (لا إلهَ إلّا اللَّهُ).

ئنجا دوعا بکە و بڵێ: (اللّهُمَ رَبّ هذه الدعوةِ التّامّة، والصَّلاة القائمة، آتِ مُحَمّداً الوسيلةَ والفضيلة، وأَبْعثهُ مقاماً مَحموداً الذي وَعدته)




# بەشی پێنجەم :

# ڕووکنی دووەمی ئیسلام : نوێژکردن

## قامەت و مانای وشەکانی قامەت:

قامەت: واتە: هەڵساندنەوە

لە شەرعدا: وشەیەکی تایبەتە نوێژخوێنانی پێ هەڵدەستێنرێ بۆ نوێژ.

## چۆنییەتی قامەت و مانای وشەکانی قامەت :

الله اكبر الله اكبر .

اشهد ان لا اله الا الله .

اشهد ان محمدا رسول الله .

حي على الصلاة .




حي على الفلاح .

قد قامت الصلاة : نوێژ نزيك بوويەوە .

قد قامت الصلاة : نوێژ نزيك بوويەوە .

الله اكبر الله اكبر .

لا اله الا الله .




## بەشی شەشەم :
## ڕووکنی دووەمی ئیسلام : نوێژکردن

دوای دەستنوێژمان هەڵگرت و بانگ درا بۆ نوێژ و (قامەت کرا، کاتێك نوێژمان بەکۆمەڵ کرد)دەست دەکەین بە ئەنجامدانی نوێژ، دەبێ بزانین ئەرکانەکانی نوێژ چین.

### ڕووکنـەکانی نوێـژ:

١- وەستان بەرامبەر قیبلە، واتە: ڕوو لەکەعبەی پیرۆز دەکەیت کەڕووگە(قیبلە)ی مسوڵمانانە). ئینجا لە دڵدا نییەت دەهێنی «کە تۆ ئەو نوێژە دەکەیت».

٢- (أللهُ أكْبَرُ) دەکەیت، واتە: خودا لەهەموو شت گەورەترە. (سوننەتە لەکاتی گوتنی أللهُ أكْبَرُ دەستەکانت بەرز بکەیتەوە تا ئەندازەی شانەکانت و نابێ پەنجەکانت لەیەك بکەیتەوە ).




**٣-** بەدەستی ڕاستمان لەمەچەکدا دەستی چەپمان دەگرین و لە ژێر سنگمـاندا دایدەنێین، واتە لە سەروو ناوکەوە دەبێت دەستمان بگرین.

**٤-سورەتی** (الفاتحە) دەخوێنین (خوێندنەوەی فاتیحە لە هەموو ڕکاتەکاندا واجبە «وە ڕوکنێکە لە ڕوکنەکانی نوێژ، بەبێ خوێندنی فاتیحە نوێژەکەت تەواو نابێ).

أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيم

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ (١)

(الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٢) الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (٣) مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ (٤) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥) اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦) صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ (٧))

مانای سورەتەکە: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ (بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان) الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (هەموو سوپاس و ستایش بۆخوای پەروەردگاری جیهانیان) الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ (بەخشندەی میهرەبان) مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ (خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشت دانەوە) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (خوایە تەنها تۆ دەپەرستین وە تەنها لە تۆ داوای یارمەتی دەکەین)، اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (ڕێنموونیمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست)، صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ (ڕێگای ئەوانەی کە چاکەت لەگەڵ کردوون و ناز و نیعمەت و بەخششی خۆتت بەسەردا ڕشتوون نەك ڕێی ئەوانەی خەشم و قینی تۆیان بەسەردا ڕژا، وە نەك ڕێی ئەوانەی کە گومڕا و سەر لێ شێواو بوون) .

آمین (خوایە دوعاکانمان قبوڵ بکە و وەڵامان بدەوە)

دوای ئەوەی کە سورەتی (الفاتحه)ـە ت خوێند و گوتت (آمین)، پاش هەناسەیەك سورەتێکی دیکە بخوێنە ..... بۆ نمونە سورەتی (ألإخلاص):

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١) اللَّهُ الصَّمَدُ (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ (٤)

ئه وجا (الله اکبر) بکه و وێنەی تە کبیرەی یەکەم جار، تا نەرمەی گوێ یاخود تا ئاستی سەرشانەکان، دەستەکانت بکەرەوە با لەپی دەستەکانت ڕووەو قیبلە بێت وپەنجەکانت جووت بێت.

٥- ئینجا دەچیە (ڕکوع - چەمینەوە)، لە ڕکوعـدا پشتت بچەمێنە و بە هەردوو دەستت سەر چۆکەکانت بگرە و پشتت تەخت و ڕێك بکە و بەشێوەیەك پشتت ڕاست بێت و سەیری پەنجەی پێکانت دەکەیت، ئینجا سێ جار دەڵێیت: سُبْحَانَ رَبِّیَ الْعَظِيمِ (پاکی و بێگەردی بۆ خودای گەورەم).





٦- لە (ڕکوع) ڕاست دەبیەوە تا پشتت ڕێك دەبێتەوە و بە جوانی بە پێوە دەوەستیت و دەڵێی: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَه، کە ڕێك وە ستایت دەڵێیت رَبَّنا وَلَك الحَمْدُ.(خودا گوێی لەو کەسە بوو کە سوپاس و ستایشی کرد، پەروەردگارمان! سوپاس و ستایش هەر بۆتۆیە).



٧- ئەوجا (الله أكبر) دەکەی و دەچیە کڕنوش بردن (سـجدە).

(کڕنوش) بردنیش دەبێ لەسەر حەوت جێگە بێ: هەردوو پێ و هەردوو چۆك و هەردوو بەری دەست و نێو چاوان لەگەڵ لووت.

ئەوجا لەکاتی سوجدە پێویستە هەموو پەنجەکان جووت بن جگە لەپەنجەی گەورە کەمێکی دوور دەخەیتەوە، نابێت ئانیشکت بەر زەوی بکەوێت، ئینجا سێ جار دەڵێی (سُبْحانَ رَبِّيَ الأَعْلى). واتە: پاك و بێ گەردی بۆ خودای بەرز و باڵام.

٨- ئەوجا (أللهُ أكْبَرُ) بکە و لە سوجدە هەستەوە ولەسەر چۆك (ئەژنۆ) دانیشە و قاچی چەپت لەژێر خۆت دابنێ و پەنجەکانی



پێی ڕاستت بنوشتێتەوە و بەرەو خوارەوە، هەردوو دەستت لەسەر هەردوو چۆکەکانت دابنێ. بە شێوازێك سەری پەنجەکان نزیك بێت لەسەر چۆکتەوە.

ئەوجا سوننەتە لێرەدا (لەنێوان دوو سوجدەدا) ئەو دوعایە بکە و بڵێ: (رَبِّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي). واتە: خودایە لێم خۆشبە و ڕەحمم پێ بکە. یان دەتوانی بەتەنها بڵێی: (رَبِّ اغْفِرْ لِي)

٩- ئەوجا بڵی: (الله أكبر) و دووبارە بڕۆ بۆ سوجدە و سێ جار بڵێ: (سُبْحانَ رَبِّيَ الأَعْلى).

١٠- دوای ئەوە دەڵێی: (الله أكبر) و هەڵدەستیەوە بۆ ڕکاتی دووەم.




## بەشی حەفتەم :

## ڕووکنی دووەمی ئیسلام : نوێژکردن

لەڕکاتی دووەم: سورەتی (الفاتحة) بخوێنە .

پاش هەناسەیەك سورەتێكی دیكە بخوێنە بۆ نمونە سورەتی (ألكوثر)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم

(إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ (١) فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ (٢) إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ (٣))

ئەوجا (الله اكبر) بكە و وێنەی تە كبیرەی یەكەم جار، تا نەرمەی گوێ یاخود تا ئاستی سەرشانەكان، دەستەكانت بكەرەوە با لەپی دەستەكانت ڕووەو قیبلە بێت وپەنجەكانت جووت بێت.



ئینجا دەچیە (ڕكوع - چەمینەوە)، لە ڕكوعدا پشتت بچەمێنە و بە هەردوو دە ستت سەر چۆكەكانت بگرە و پشتت



تەخت و ڕێك بکە و بەشێوەیەك پشتت ڕاست بێت و سەیری پەنجەی پێکانت دەکەیت، ئینجا سێ جار دەڵێیت: **سُبْحَانَ رَبِّى الْعَظِيمِ** (پاکی و بێگەردی بۆ خودای گەورەم).

لە (ركوع) ڕاست دەبیەوە تا پشتت ڕێك دەبێتەوە و بە جوانی بە پێوە دەوەستیت و دەڵێی: **(سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَه)**، کە ڕێك وەستای دەڵێیت: **رَبَّنا وَلَك الحَمْدُ** (خودا گوێی لەو کەسە بۆ و، کە سوپاس و ستایشی کرد، پەروەردگارمان! سوپاس و ستایش هەر بۆتۆیە).

ئەوجا (الله أكبر) دەکەی و دەچیە کڕنوش بردن (ســجدە).

ئەوجا لەکاتی سوجدە پێویستە هەموو پەنجەکان جووت بن جگە لە پەنجەی گەورە کەمێکی دوور دەخەیتەوە، نابێت ئانیشکت بەر زەوی بکەوێت، ئینجا سێ جار دەڵێی **(سُبْحانَ رَبّيَ الأَعْلى)**. واتە: پاك و بێ گەردی بۆ خودای بەرز و باڵام.





ئەوجا (أللهُ أكْبَرُ) بكە و لە سوجدە هەستەوە ولەسەر چۆك (ئەژنۆ) دانیشە و قاچی چەپت لەژێر خۆت دابنێ و پەنجەکانی پێی ڕاستت بنوشتێتەوە و بەرەو خوارەوە، هەردوو دەستت لەسەر هەردوو چۆکەکانت دابنێ. بە شێوازێك سەری پەنجەکان نزیك بێت لەسەر چۆکتەوە.

ئەوجا سوننەتە لێرەدا (لەنێوان دوو سوجدەدا) ئەو دوعایە بکە و بڵێ: (رَبِّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي). واتە: خودایە لێم خۆشبە و ڕەحمم پێ بکە. یان دەتوانی بەتەنها بڵێی: (رَبِّ اغْفِرْ لِي)

ئەوجا بڵێ: (الله أكبر)و دووبارە بڕۆ بۆ سوجدە و سێ جار بڵێ: (سُبْحانَ رَبِّيَ الأَعْلى).



دوای تەواو بوونی (سوجدەی دووەم)، (ألله‌أكبر) بکەو بەڕێکی دانیشە و (ألتحیات) بخوێنە.

ئەم دانیشتنەت با بەم شێوەیە بێ: لاقی چەپ لە ژێر خۆتدا

ڕابخە و لەسەری دانیشە و سنگی پێی ڕاستیشت ڕێك دابنێ

و دەستەکانیشت نزیك لە چۆکتەوە دابنێ. دەستی چەپت ئاسایی دادەنێیت ڕابخە لەسەر ڕانی چەپت بە کراوەیی دابنێ و پەنجەکانت جووت بکە، دەستی ڕاستیشت هەموو پەنجەکانی دابخە جگە لە پەنجەی شایەتومان کە بە ڕێك و نوشتاوەیی بیهێڵەوە.

### چۆنیەتی خوێندنی (ألتحيات):

(التَّحِيَّاتُ للهِ، وَالصَّلَوَاتُ، وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ).

واتە: سەلامو موڵكو گەورەییو پەرستشو وشە و کردەوەی پاك و چاك هەر بۆ خودایە، ئاشتی و ڕەحمەتی خودات لەسەر بێت ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئاشتی لەسەر ئێمەش و لەسەر هەموو بەندە چاکەکانی خودابێت، شایەتی دەدەم، کە هیچ پەرستراوێك شایستەی پەرستن نییە، جگە لە (الله)، شایەتیش دەدەم، کە محمد ﷺ بەندە و نێردراوی خودایە.

## چۆنێتی سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای تەحیات

(اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ, كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ, إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ, اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ, إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ).

واتە: خودایە درووددو سەڵاوات بڕژێنە بەسەر موحەممەدو خانەوادەی محمددا ﷺ، هەر وەکو چۆن درووددت ڕژاند بەسەر ئیبراهیمو خانەوادەی ئیبراهیمدا، بەڕاستی تۆ سوپاسو ستایش کراویتو خاوەن شکۆییت، خودایە پیرۆزی بڕژێنە بەسەر محمدو خانەوادەی محمدداﷺ، هەر وەکو چۆن پیرۆزیت ڕژاند بەسەر ئیبراهیمو خانەوانەدەی ئیبراهیم دا، بەڕاستی تۆ سوپاسو ستایش کراویتو خاوەن گەورەییو شکۆیت.

هەر کە تەحیاتت تەواو کرد ئەوجا بەلای ڕاست سەلام دەدەیەوە و دەڵێی: (اَلسَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ)

ئەوجا بەلای چەپ سەلام دەدەیەوە و دەڵێی: (اَلسَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ)

بە سەلام دانەوەش نوێژەکە کۆتایی پێ دێت.



**تێبینـی:**

**١- لەو نوێژانەی دوو ڕكعەتە، لەڕكعەتی دووەم پێویستە التحیات و سەڵاواتیش بخوێنیت.**

**گەر سێ یان چوار ڕكعەت بوو، لەڕكعەتی دووەم تەنها تەحیات دەخوێنێت، لەڕكعەتی سێیەم یان چوارەم تەحیات و سەڵاواتیش دەخوێنیت.**

**٢- ئەگەر یەكێك واز لە یەكێك لەم ڕووكنانە بهێنێت و بزانێت بە بێ هیچ پۆزشێك نوێژەكەی بەتاڵ دەبێت و پێویستە دووبارەی بكاتەوە، بەڵام ئەگەر لێی تێك چوو ئەتوانێت سوجدەی سەهوو ببات.**

## نوێژ لە ڕووی تەندروستییەوە

جوڵەی فیزیکی بەردەوامی نوێژی موسڵمانان لەپاڵ لابردن و چارەکردنی کێشە دەروونییەکانی وەکو (توڕەیی و خەمۆکی) هاوکات ئازاری پشتیش کەمدەکاتەوە و لاستیکی بوونی زیاتر بە جومگەکان دەبەخشێت ئەگەر بێت و بەشێوەیەکی ڕاست و دروست ئەنجام بدرێت[١].

(1)independent/islamic-prayer-ritual-muslim-reduce-back-pain-joint-elasticity-health-body-study

-dailymail.co.uk/health/Islamic-prayer-ritual-reduces-pain-study-reveals




# بەشی یەکەم:

# ڕووکنی سێیەمی ئیسلام: زەکات

## زەکات چیە؟

زەکات: بریتییە لە دەرکردنی ئەو بەشە ماڵەی کە شەرع فەرزی کردووە لە ماڵێکی دیاری کراو بۆ کۆمەڵێکی دیاری کراو.

بەزەکات ماڵ کەم ناکات بەڵکو زیاد دەکات وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (..وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ)[1] واتە: ئەو زەکاتەی کە دەری دەکەن لە ماڵەکەتان و مەبەستان خوایە؛ ئەوا چەند جارە خوای گەورە ئەو ماڵە زیاد دەکات.



(١) (سورة الروم:٣٩).

## ئەوانەی زەکاتیان پێدەشێت کێن؟

دەربارەی ئەوکەسانەی زەکاتیان پێ دەشێت خوای پەروەردگار لەقورئاندا باسیان دەکات و دەفەرموێ:

**(إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ ۖ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦٠﴾)**[1] واته؛ بێگومان زەکات تەنها بۆ هەژارو نەداران و ئەو کەسانەی کەکارمەندن بەسەریەوە و بەو موسڵمانە نوێیانەی کە هێشتا ئیمان جێگیر نەبووە لەدڵیاندا و بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان و بۆ (یارمەتیدانی) قەرزدارەکان و بۆ گەیاندنی ئاینی خوا (هەر بوارێك کە خزمەت بەبانگەوازی ئیسلام بکات و ئاینی خوا بەرەو پێش و سەرکەوتن ببات) هەروەها بۆ ئەو ڕێبوارانەش کە پارەیان لێ دەبڕێت و نەدار دەکەون، (دابەشکردنی زەکات بەو شێوەیە) فەرزە لە لایەن خواوە لەگەردنی ئیماندارانداا، خواش زاناو دانایە (لەسامان بەخشین و فەرزکردنی زەکاتدا).

(١) التوبة (٦٠)




# بەشی دووەم:

# ڕووکنی سێیەمی ئیسلام : زەکات

## زەکاتە لەسەر کێ واجبە؟

زەکات لەسەر ئەم چینانە واجبە: (ئیسلام بێ، ئازادبێ و کۆیلەنەبێت، خاوەنی ئەندازەی زەکات بێت بەمانەوە، وە تێپەڕبوونی ساڵ بەسەریدا جگە لە بەروبوم و دانەوێڵە).

(بەرووبووم و دانەوێڵە مەرج نییە ساڵیان بەسەردا بسوڕێتەوە چونکە کاتین یان وەرزین، زەکاتیان لەسەرە بەو مەرجەی بگەنە بڕی دیاریکراو لەشەرعدا).

## ئەو ماڵانەی کەزەکاتیان تێدا واجبە چییە؟

١- زێڕ و زیو - پارە

٢- دانەوێڵە

٣- مەڕوماڵات

٤- خەزێنەی دۆزراوەی سەردەمی پێش هاتنی ئاینی ئیسلام .

## حوکمی ئەو کەسەی زەکات نادات یان باوەڕی پێی نییە؟

ئەگەر کەسێك باوەڕی پێ نەبێت ئەوا بێ باوەڕ دەبێت و لەئیسلام دەردەچێت.

بەڵام کەسێك باوەڕی بە واجبیەتی زەکات هەبێ و زەکات نەدات لەبەر هەر هۆیەکی تر بێت . ئەوا کافر نابێت ، بەڵام تاوانێکی گەورەی ئەنجامداوە و لە قیامەتدا سزایەکی سەختی بۆ هەیە.




# بەشی سێیەم:

# ڕووکنی سێیەمی ئیسلام : زەکات

## حیکمەت چیە لە زەکاتدان؟

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانرێت کە خوای پەروەردگار هیچ شتێك فەرز ناکات ئیلا لەبەر حیکمەت نەبێت ، و چەندان بەرژەوەندی تێدایە ، خوای پەروەردگار زانایە ، و زانستەکەی پەی بەهەموو شتەکان بردووە.

**زانایان چەندان حیکمەتیان باس کردووە لەسەر زەکات ، لەوانە:**

* حیکمەت لە زەکات پاککردنەوەی دەروونە لە چاوچنۆکی.

* هۆکارە بۆ بەدەستهێنانی ڕەحمەتی خوای پەروەردگار.

* سیفەتێکە لە سیفەتەکانی ئەو باوەڕدارانەی ئەچنە بەهەشتەوە.

* دڵ فراوان دەکات.

* کۆمەڵگای موسوڵمان دەکات بە یەك خێزان ، کەسی دەوڵەمەند بەزەیی بەهەژاردا دێتەوە ، و کەسێکی بەهێز بەزەیی بەلاواز دەکات، مرۆڤ هەست دەکات کە چەند برایەکی هەیە پێویستە لەسەری چاك بێت لەگەڵیان هەروەك چۆن خودا چاك بووە لەگەڵی.

* کاریگەری باشی دەبێت لە کەمکردنەوەی تاوان بەتایبەتی دزی؛ چونکە هەژارەکان پێویستیەکانیان جێ بەجێ دەبێت .

* دەبێتە هۆکاری زیاد بوونی ماڵ، پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ:- (ماڵ بەبەخشین کەم ناکات)[١] .

* هۆکارە بۆ دابەزینی خێر.

* تورەیی خودا ناهێڵێت، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (بەڕاستی خێر وسەدەقە تورەیی خودا ناهێڵێ و دەیکوژێنێتەوە)[٢].

* دەبێتە هۆکاری سڕینەوەی تاوان، خوای گەورە دەفەرموێ : (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا)[٣] واتە: ئەی محمد ﷺ لە ماڵەکانیان صەدەقەو خێرێك وەربگرە یان زەکاتی فەرز وەربگرە کە بەهۆیەوە پاکیان ئەکەیتەوە لەو تاوان و شتانەی کە پێیانەوەیە.

(١) پێشەوا موسلیم گێڕاوێتیەوە
(٢) صححه الألباني في «صحيح الجامع» (٣٧٥٩)
(٣) التوبة (١٠٣)




## بەشی یەکەم:
## ڕووکنی چوارەمی ئیسلام: ڕۆژوو

### پێناسەی ڕۆژوو:

١- ڕۆژوو: بریتی یە لە خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە.



٢- ڕۆژوو لە ڕووی شەرعیەوە بریتیی یە لە: بەندایەتی کردن بۆ خودا بە خۆگرتنەوەو خۆپارێزی لەهەموو ئەو شتانەی ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە لە دەرکەوتنی کازیوە (فەجر) تاوەکو ئاوا بوونی خۆر.

ڕۆژوو (بەعەرەبی: الصیام) کە بە مانای وازهێنان لەشتێك دێت، بۆ نمونە واز لە خواردن یان قسەکردنی بێسوود و جنێو بهێنیت.

ڕۆژووی ڕەمەزان ئەرکە لەسەر موسڵمانان وەك خوای پەروەدگار دەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيكُمُ الصِيامُ كَما كُتِبَ عَلَى الذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ﴾[١]. واتە: ئێوە ڕۆژووتان لەسەر نوسراوە وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێش خۆتان نوسرا بوو.

دەربارەی فەزڵی ڕۆژوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( مَن صامَ رَمَضانَ إيمانًا واحْتِسابًا غُفِرَ له ما تَقَدَّمَ مِن ذَنْبِهِ)واتە؛ هەرکەسێك مانگی ڕەمەزان بە باوەڕەوە بەڕۆژوو بێت و چاوەڕێی پاداشت بێ، خوا لە گوناهەکانی لەوەپێشی ئەبورێت[٢].

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای گەورە فەرموودەیە : (كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ له إلَّا الصَّوْمَ، فإنَّه لي وأنا أجْزِي به)[٣] واتە؛ هەموو کردەوەکانی ئادەمیزاد بۆ خۆیەتی جگە لە ڕۆژوو، ئەوە بەڕاستی بۆمنە و هەر خۆشم پاداشتی دەدەمەوە.

---

(١) البقرة (١٨٣)

(٢) پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی کردووە

(٣) پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی کردووە(هەر فەرموودەیەك پێغەمبەری خوا ﷺ بڵێت خوای گەورە فەرموویەتی ئەوا ئەو فەرموودەیە قودسییە)

لەو فەرموودە شیرینانەوە بۆمان دەردەکەوێت گەورەیی ڕۆژوو چەندەو چ پاداشتێکی گەورەی هەیە بۆ ئەوکەسەی بەڕۆژوو دەبێت جا لەمانگی ڕەمەزان بێت یان لەکاتە دیاریکراوەکانی تر بێت.

## ڕۆژوو لەسەر کێ پێویستە (واجبە)؟

ئەو کەسەی دەیەوێت بەڕۆژوو بێت دەبێت چەند مەرجێکی لێ بێتەجێ، لەوانە:

* ئەوکەسە موسوڵمان بێ: ڕۆژوو لە سەر بێباوەڕ نییە.

* پێگەیشتبێ و خۆی ناسیبێ و هۆش و فامی تەواو بێت (عاقل بێ، چونکە مرۆڤ ئەرکی شەرعی ناکەوێتە سەر ئەگەر منداڵ بێ، یا هۆش و فامی تەواو نەبێ .

* توانای ڕۆژوو گرتنی هەبێت لەڕووی جەستەییەوە (واتە نەخۆشییەکی نەبێت بەهۆی ڕۆژوو گرتنەوە حاڵی خراپ بکات).




## بەشی دووەم

## ڕووکنی چوارەمی ئیسلام: ڕۆژوو

### لە چ کاتێک مرۆڤ دەتوانێت بەڕۆژوو نەبێت:

هەندێك حاڵەت هەیە کە ڕێگە دەدات مرۆڤ بە ڕۆژوو نەبێت بە مەرجێك دواتر بیگێڕیتەوە پێش ئەوەی ڕەمەزانێکی تری بەسەردا بچێ.

ئەگەر نەیگێڕایەوە بەهۆی نەخۆشی درێژخایەن ئەوکاتە پێویستە فیدیە بدات، بۆ هەر ڕۆژێك ( یەك کیلۆ و نیو برنج یان خواردنی تر) خواردن دەبێت بدات بە هەژارێك، ئەو کەسانەشی توانای ڕۆژوو گرتنەوەیان هەیە بەڵام ڕەمەزانێکی بەسەردا دەڕوات و نایگرنەوە، دواتر دەبێ ڕۆژووەکە بگرنەوە و فیدیەش بدەن.




**ئەو حاڵەتانەی ڕێگەیان پێدراوە بەڕۆژوو نەبیت ئەمانەن:**

* گەشتکردن.
* نەخۆش بوون.

## ڕۆژووی سووننەت:

**چەندین ڕۆژووی سووننەت هەیە لە ئیسلامدا کە گرتنیان ئەرك نییە، بەڵام سوننەتن وەك؛**

* ڕۆژووی شەش ڕۆژی مانگی شەوال.
* ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە.
* ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا.
* ڕۆژووی زۆربەی مانگی شەعبان.
* ڕۆژوو گرتنی دووشەممە و پێنج شەممان لە هەفتەدا.
* ڕۆژووی سێ ڕۆژە سپییەکان (کە ١٣ و ١٤ و ١٥ی هەموو مانگە کۆچییەکان) و ... هتد.




# بەشی سێیەم:
# رووکنی چوارەمی ئیسلام: ڕۆژوو

## فەزڵی ڕۆژوو:

**بێگومان ڕۆژوو چەندان فەزڵی هەیە کە لەقورئان و سوننەدا ئاماژەی پێ دراوە، لەوانە:**

١- ڕۆژوو لەڕۆژی دواییدا تکا (شەفاعەت) بۆ خاوەنەکەی دەکات.

٢- ڕۆژوو یەکێکە لەو کردەوانەی کەخودا پەیمانی داوە بە خاوەنەکەی لێی خۆش بێت وپاداشتی گەورەی بداتەوە

٣- ڕۆژوو دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناح وتاوانەکان.

٤- زۆر بەڕۆژوو بوون هۆکارێکە بۆ چوونە بەهەشت.

٥- بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لەلای خودا خۆشترە لە بۆنی میسك.

## حیکمەت لەفەرز کردنی ڕۆژوو[١]:

### ڕۆژوو چەندان سوود و حیکمەتی گەورەی تێدایە، لەوانە:

١- ڕۆژوو ڕێگایەکە بۆ دەس خستنی تەقوای خودا .

٢- کەسی ڕۆژووەوان هەست دەکات بەنیعمەتەکانی خودا .

٣- ڕاهێنانی دەروون لەسەر خۆڕاگری وئارام گرتن و بەهێزی و بەرگە گرتنی ناخۆشیەکان.

٤- ڕۆژوو دەبێتە هۆکاری لوت شکاندنی شەیتان.

٥- ڕۆژوو دەبێتە هۆکاری ڕەحمەت وبەزەیی هاتنەوە بەهەژاراندا.

٦- ڕۆژوو لاشە پاك دەكات لە جۆرەها شتی ناتەندروست ،ودەبێتە هۆكاری بەدەسهێنانی تەندروستیەكی باش وبەهێز بوون.

### لەڕووی زانستییەوە:

لە ڕووی تەندروستیەوە زۆر سودی هەیە کە لەشی مرۆڤ پاك دەكاتەوە لەخواردنە ژەهراویەكان، خواردنە گیانەوەرییەكان ماددەی چەوریيان تێدایە كە زۆربوونی دەبێتە هۆی توشبوونی مرۆڤ بەزۆر چەوری لەخوێندا، لە پاشاندا ڕۆژوو كاریگەریەكی ئێجگار باشی هەیە و نیشانەكانی كەم دەكاتەوە.

(١) وەرگیراوە لە (موسوعة الفقهية) لە ماڵپەڕی (الدُّرر السَّنية)




## بەشی یەکەم:
## ڕووکنی پێنجەمی ئیسلام:
## حەج کردن:

حەجکردن یەك جار فەرزە لەسەر هەموو تاکێکی موسڵمان گەر توانای هەبێت بەپێی مەرجە شەرعییەکان.



خوای پەروەردگاردەفەرموێ: ﴿وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ (٢٧)﴾[١]، واتە: وە بانگ بدە بە ناو خەڵکیدا بابێن بۆ حەج.

حەج لەلایەنی زمانەوانییەوە نیاز و مەبەست دەگەیەنێت، بەڵام لە ڕووی ئاینیەوە ڕۆیشتن و بەڕێکەوتنە بەرەو ماڵی خودا (بیت الله الحرام) و چەند شوێنێکی دیکە بۆ بەجێهێنانی چەند پەرستنێکی تایبەتی لەکاتێکی سنووردار و بە شێوەیەکی دیاریکراو.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِلْعَالَمِينَ (٩٦) فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَنْ دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ﴾[٢] واتە: بەڕاستی یەکەم خانەیەك کە بۆ خەڵك دانراوە ئەو خانەیە کە لە مەککەی پیرۆزە، وە هۆی ڕێنمایی جیهانیانە، لەو شوێنەدا نیشانەی ڕوون و ئاشکرای خودای تێدایە، ئەویش شوێنی وەستانی ئیبراهیم (علیه السلام)ە، وەهەرکەس بچێتە ناوی لە ئەمن و ئاسایشدا دەبێت، وە خودا لەسەر خەڵك دایناوە چوون بۆ ئەوخانەیە بۆ حەج هەر کەس کە لە توانای دا هەبێت، وە هەر کەس باوەڕی بەوە نەبێت و کافر بێت، بەڕاستی خودای گەورە دەوڵەمەندە و بێ نیازە لە جیهانیان.

(١) الحج

(٢) آل عمران ﴿٩٦﴾﴿٩٧﴾

## مرۆڤ لەژیانیدا یەکجار حەج دەکات:

ئیبن عەبباس دەفەرمویٚ: پیٚغەمبەر ﷺ ووتاری بۆ دەداین فەرمووی: ((یاأیُها النَّاسُ کُتِبَ عَلَیکُم الحجّ))[1]، واتە: ئەی خەڵکینە حەجتان لەسەر فەرز کراوە. ئەقرەعی کوڕی حابس هەڵسا گوتی: هەموو ساڵیٚك ئەی پیٚغەمبەری خودا ﷺ؟ فەرمووی: حەج یەکجارە، هەرکەس زیاتر بکات ئەوە (خۆبەخشانەیە).

(١) پیٚشەوایان بوخاری و موسلیم گیٚڕاویٚتیانەوە







# بەشی دووەم:
# ڕووکنی پێنجەمی ئیسلام:
# حـــەج کـردن

## فەزڵـەکانی حـەج کردن چـین؟

هەر کەسێك حەج بکات بۆ خوای گەورە و نیەت و مەبەستی خوای گەورەبێ و هەموو ڕووکنەکانی جێبەجێ بکات و حەجەکەی وەرگیراو بێت ( الحج المبرور)، ئەوکاتە بەدڵنیاییەوە ئەم فەزڵانەی پێ دەبەخشرێت:

١- گوناهەکانی پێشوو لەناو دەبات و نایانهێڵێت.

٢- ئەوەی حەجی کرد، خۆی دەرباز دەبێت لە ئاگری دۆزەخ.

٣- پاداشتی حەج بەمسۆگەری بەهەشتە.

وە مەرجە دوای تەواو بوونی حەجەکەی، ئەو کەسە نەگەڕێتەوە سەر تاوان و سەرپێچی کردن.




## مەرجەکانی پێویست بوونی حەج چییە؟

زانایان بۆ پێویست بونی حەج لەسەر ئەم مەرجانەی خوارەوە ڕێك کەوتون:

١- موسڵمان بێ.

٢- تەمەنی پێگەیشتبێت (بالغ)بووبێت.

٣- عەقڵی تەواو بێ.

٤- ئازادبێت و کۆیلە نەبێ.

٥- توانای هەبێت لەڕووی دارایی و تەندروستییەوە.

هەرکەس ئەو مەرجانەی تێدا نەبوو حەجی لەسەر پێویست نابێ.




# بەشی سێیەم:
# ڕووکنی پێنجەمی ئیسلام:
# حـــەج کــردن

## ڕووکنەکانی حەج و عومرە چین؟

کارەکانی حەج و عومرە پێك هاتووە لە (٤) چوار پایە دەبێ هەمووی جێ بەجێ بکرێت بەڕای سەرجەمی زانایان ، بەنەکردنی یەك لەو کارانە حەج یا عومرە قەبوڵ نابێت وە هیچ کارێکی دیکە جێگەی ئەو کارانە ناگرێتەوە. ئەو چوار پایەیە ئەوانەن:

١- ئیحرام بەستن (الاحرام): ئیحرام نیەت هێنانی چوونە ناو کارەکانی حەج و عومرە ودەست پێکردن بە کارەکانیانە.

٢- ڕاوەستان لەعەرەفە: وەستان لەعەرەفە ڕوکن و پایە گەورەکەی حەجە.

٣- تەوافی ئیفازە (طواف الافاضة): تەوافی (ئیفاضة) ڕووکنێکە لە ڕووکنەکانی حەج ئەگەر حاجیەك نەیکات حەجەکەی بەتاڵە.

٤- بەپەلە ڕۆیشتن و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەروە (سعی).



## لە کۆتاییدا

لەم پەرتوکەوە ئێمە بەشێوەیەکی سەرەتایی اللـــە (خوا) و پێغەمبەرەکەیمان ﷺ ناسی و پایە و بنچینەکانی ئیسلامیش فێربووین، جا پێویستە ئەوانەی فێری بووین خۆشمان بوێن و بە وتە بیڵێین و بە کردەوەش جێبەجێی بکەین تا موسڵمانێکی تەواو بین و کەم و کوڕیمان نەبێ بەرامبەر الله (خوا).

ئەگەر ئاوامان کرد ئەوکاتە الله (خودا) ئێمەی زیاتر خۆش دەوێت و دەمانپارێزێت لەهەموو کارێکی خراپ.

الحمدلله کە موسڵمانین و ڕازین بەوەی اللـــە خوامان بێت و محمد ﷺ نێردراوی خوابێت و ئیسلام دین و ڕێبازمان بێت.

الحمدلله رب العالمين

# سەرچاوەکان

- سایتی ڕێبازی ئیسلام
- سایتی حیکمە
- سایتی تەنزیل
- موقع الصلاة
- شبكة فقه الصلاة
- الشرح الفقهي المصور - صفة الصلاة
- صحيح البخاري.
- صحيح مسلم.
- قرآ
- وێکی عەرەبی
- کتێبی شایەتمان
- سایتی وەڵامەکان.

# نـــاوەڕۆك

# پەیکانی بادەر

# بۆ منداڵان

نوسینی

سالار عومەر

ناوی کتێب: پایەکانی باوەر بۆ منداڵان

ناوی نووسەر: سالار عومەر

هەڵەچن : ئاسیا حسێن

دیزاینی تێکست: زەردەشت کاوانی

دیزاینی بەرگ: ڕێدار عومەر

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٢

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (      )ی ساڵی (٢٠٢٢)ی پێ دراوە.



٠٧٥٠٧١٤٧٠٣٧

# پێشکەشە بە

مندالەکانم

پێشکەشە بە خێزانی خۆشەویستم.

بەهەموو منداڵە خۆشەویستەکان.

بە هەموو ئەو کەسانەی یارمەتیدەر و هاوکارم

بوونە بۆ کاری خێر بەتایبەت.

# پێشەکی

مرۆڤی موسڵمان دەبێ پێش هەموو شتێك دینەکەی باش بناسێت و بزانێت چۆنە و چییە و بزانێت خوای کێیە و بەرنامەکەی چییە، تا لەم ڕێگەیەوە بتوانێت بەتێگەیشتنەوە دینداریيەکی جوان بکات و نمونەیەکی جوان نیشان بدات.

هەروەك چۆن پایەکانی ئیسلام بناغە و ئەساسی دینە بەهەمان شێوە پایەکانی باوەڕیش بەشێکی سەرەکییە و بناغەو ئەساسی دینە، بۆیە مەرجە بۆ موسڵمان شارەزاییەکی تەواوی هەبێت لەم پایانەی باوەڕ تا ئیمانێکی بەهێز و جێگیری هەبێت و بەردەوام لەگەڵ ئەم ئیمانە بژیێ و هیچ کاریگەرییەکی دەرەکی کاری لێ نەکات و ڕێڕەوی ئیمانی نەگۆڕێت.

بۆیە پێویستە موسڵمان ئەم پایانەی باوەڕ بەباشی بخوێنێت و شارەزایی زۆر باش پەیدابکات.

داواکارم لەخوای گەورە ئێمە و ئێوەش شارەزابکات لەدینە پاك و ڕێژین سافەکەی... آمین.




# پایەکانی باوەڕ چین؟

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾[١] واتە: پێغەمبەر و ئیماندارا‌ن باوەڕیان هەیە بەوەی لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتووەتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە خوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی (دەڵێن) هیچ جۆرە جیاوازییەك ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانی خوادا.

کاتێك لە پێغەمبەر ﷺ پرسیار کراوە لەسەر باوەڕ، لە وەڵامدا فەرموویەتی: {أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر، وتؤمن بالقدر خيره وشره}[٢] واتە: باوەڕت بە خوا و فریشتەکانی و

(١) البقرة (٢٨٥)

(٢) پێشەوا موسلیم گێڕاوێتییەوە بەژمارە ( ٨ )

کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و و ڕۆژی دوایی هەبێت، هەروەها باوەڕت بە قەدەر هەبێت بە باش و خراپییەوە.

## شەش بنچینەکەی باوەڕ:

### شەش بنچینەکەی باوەڕ بریتین لە باوەڕ هێنان بە:

١- الله (خوا ) :کە تاك و تەنهایە و هیچ هاوەڵێکی نییە.

٢- فریشتەکان : ئەوانەی کە دەیانناسین و نایانناسین.

٣- پەرتووکەکان : ئەوانەی کە بۆ پێغەمبەران دابەزێنراون.

٤- پێغەمبەران : هەموویان بە بێ جیاوازی.

٥- ڕۆژی دوایی : لەناو گۆڕ تا بەهەشت و دۆزەخ.

٦- قەدەر : خۆشی و ناخۆشییەکانی.




# یەکەم ڕووکنی باوەڕ

# باوەڕبوون بە اللـــە ( خوا).

الله (خوا)، زاتێکی بێ هاوتا و دادپەروەرە، نەمرە و هیچ هاوەڵ و هاوبەشێکی نیە، پەرستراوی حەقی هەموو دروستکراوانە، خاوەن ڕەهایی تەواوە، و بڕیاردان و خاوەنێتی بە دەستە، و پەرستراوی حەقە و تاك و تەنهایە و جێی ڕاز ونیازە، خاوەنی هەموو سیفەتێکی تەواوە، لە کەس نەبووە و کەسی لێ نابێت و هاوبەشی نیە، بەخشندە و میهرەبانە، لە گوناهــ خۆش دەبێت و گەڕانەوە وەردەگرێت و جیاوازی ناکات لە نێوان خەڵکدا تەنها بە کردەوەی چاك نەبێت.

دروستکەری گەردوونە و باڵادەستە بەسەر هەموو شتێکدا، جیاوازە لە هەموو دروستکراوانی و دوورە لە پێشبینی مرۆڤ.




## باوەڕبوون بە الله (خوا) چوار بوار دەگرێتەوە:

### یەکەم: باوەڕبوون بە بوونی الله ( خوا).

ئەم تەوەرەیە وەك بەڵگە لەسەر بوونی الله ( خوا ) بەچوار شێواز دەخەینەڕوو :

**١- بەسروشتی پاك (فیترەت)لەدایك بوون:** هەموو مرۆڤێك ئەوانەی فیترەتیان تێك نەچووە باوەڕیان بەبوونی الله (خوا) هەیە و هەموو نەوەی ئادەم پێش ئەوەی لەدایك ببن الله (خوا) پەیمانی لێ وەرگرتوون، پەیمانەکەش بریتییە لەشاهێدیدان لەسەر بوونی الله(خوا).

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ ( ١٧٢ )﴾[١]

یادی ئەوکاتەش بکەرەوە کە پەروەردگارت پشتاو پشتی نەوەی ئادەمی کۆ کردەوە (لە جیهانی پەنهان و شاراوەدا پەیمانی لێ وەرگرتن) و کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە و (پێی فەرموون): ئایا من

---

(١) الأعراف

پەروەردگاری ئێوە نیم؟! هەموو وتیان: نابێت تۆ خوای ئێمە نەبیت، بەڵێ شایەتیمان داوە (کە تۆ پەروەردگارمانیت)، ئەمەش بۆ ئەوەی نەوەکو لە ڕۆژی قیامەتدا بڵێن: بەڕاستی ئێمە لەمە بێئاگا بوین!!

لەڕاستییدا ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ خوای خۆی دەناسێت بە هۆی فیترەتەکەیەوە، بۆیە فیترەتەکان فەراهەم هێنراوە لەسەر ناسینی خوای گەورەو بە تەنها پەرستنی.

**تێبینی:** جگە لەمرۆڤەکان تەنانەت ئاژەڵەکانیش باوەڕیان بە بوونی الله (خوا) هەیە.

**٢- بەعەقڵ:** لەڕووی عەقڵەوە گەر سەیری دەورووبەرمان بکەین دەبینین ئێمە و چەندین دروست کراوی تر هەن لەزەوی و ئاسمانەکان، بێگومان ئەم دروستکارانەش بەبێ دروست کەرنین و هەر لەخۆوە دروست نەبوون، بەڵکو دەبێ خوایەك هەبێ دروستی کردبن، وەك لەقورئانی پیرۆزدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:- (أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ(٣٥))[١]

واتە:- ئایا ئێوە بەبێ هیچ شتێك دروست کراون و لە هیچ دروست کراون؟ یاخود خۆتان خۆتانتان دروست کردووە؟ نەخێر هیچیان نیە بەڵکو خوایەك هەیە کە ئێوەی دروست کردووە.

(١) الطور

کەواتە هیچ مرۆڤێك یان هیچ ئاژەڵ و داروودرەخت و ئاو و دەریا و زەریاکان هەر لەخۆیەوە دروست نەبوون بەڵکو خوایەکە هەیە دروستی کردوون، بێگومان ئەو خوایەش تەنها الله یە.




# بەشی دووەم:
# یەکەم ڕووکنی باوەڕ
# باوەڕبوون بە اللە (خوا)

٣- بە شەرع: بەڵگەی شەرعی لەسەربوونی خوای پەروەردگار کتێبە ئاسمانییەکانە، وە قورئانی پیرۆز بەڵگەی زۆری لەناو نوسراوە لەسەر بوونی اللە (خوا)، وەك لەم ئایەتەپیرۆزەدا هاتووە:-
﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾[١].

واتە:- بەڕاستی پەروەردگارتان ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروست کردووە پاشان (خوا) چووە سەر عەرش (ئێمە ئیمانمان پێ یەتی بەڵام شێوەکەی نازانین) بە( تاریکایی) شەو( ڕۆشنایی) ڕۆژ دادەپۆشێ (بەپێچەوانەشەوە) (ڕۆژ بەشوێن شەوەوەیە بە خێرایی و) شەو بەشوێن ڕۆژەوەیە بە

(١) [الأعراف: ٥٤]

خێرایی خۆرو مانگ و ئەستێرەکانیش ژێر بار کراوون بەفەرمانی خۆی بێدار بن کە بەدی هێنان و فەرماندان هەر بۆ خوایە پاك و بێ گەردە(لەهەموو کەم و کوڕی یەك) خوای پەروەردگاری جیهانیان.

چەندین ئایەتی تر هەن ئاماژە بەبوونی خودا دەکەن و دەیسەلمێنن الله بوونی هەیە و دروستکاری هەموومانە.

## ٤- بەهەست کردن: نیشانەی هەستکردن بەبوونی اللـه (خوا ):-

نیشانەی هەستکردن بەبوونی الله لە دوو ڕوانگەوە سەیر دەکەین:

**یەکەم:** موعجیزەی پێغەمبەران کە نیشانی خەڵکیان داوە، یان گوێبیستی بوون بەڵگەی یەکلاکەرەوەن بۆ بوونی (الله)خودا، چونکە موعجیزەکان لەتوانای مرۆڤ زیاترن و هیچ مرۆڤێکی ئاسایی ناتوانێت کاری لەوشێوەیە ئەنجام بدات، پێغەمبەرانیش بەیارمەتی الله (خوا) ئەو کارانەیان ئەنجام داوە.

## کەمێك لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەکورتی و گەورەترین موعجیزەش قورئانی پیرۆزە:

١- موعجیزەی ( الإسراء والمعراج) شەو ڕەوی لە مەککەوە بۆ قودس پاشان لەوێشەوە بۆ ئاسمان)،وەك لەقورئان و فەرموودەش باس کراوە.

٢- موعجیزەی لەت بوونی ( مانگ ).

٣- زۆر بوونی خواردن لەسەر دەستی پێغەمبەر ﷺ تەنانەت سەر کردە و جەیشەکان لێیان دەخوارد و وەك خۆی دەمایەوە .

٤- دەرچوونی ئاو لەنێوان پەنجەکانیەوە ﷺ و زۆر بوونی تاوەکو هەموو هێزەکە لێیان خوارد و دەسنوێژیان لێ گرت.

٥- هەواڵ پێدان و ڕاگەیاندنی چەند بابەتێکی غەیبی کە دواتر ڕوویان داوە .

٦-سەلام کردنی بەرد لێی کاتێك لەمەککە بوو .

٧- چاك بوونی نەخۆش لەسەر دەستی .

موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ زۆرن، ئەمە بەشێك بوو لە موعجیزەکانی.

دووەم: ئەوکاتەی مرۆڤ هاوار دەکاتە خوای گەورە و داوای شتێك دەکات و وەڵام دەدرێتەوە لەلایەن خودا، ئەمە بەڵگەی هەستییە، ئەو خۆی جگە لە خوای گەورە هاواری بۆ کەس نەبردووە، خوای گەورەش وەڵامی داوەتەوە، ئەوەشی بەچاوی خۆی بینیوە.

نمونەیەك لەقورئانی پیرۆز کاتێ خوای گەورە وەڵامی پێغەمبەر نوح دەداتەوە (علیەالسلام):-: ﴿وَنُوحًا إِذْ نَادَى مِن قَبْلُ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَنَجَّيْنَاهُ ﴾[١] وە پێشتر نووح پێغەمبەر (علیە السلام) هاواری (لە ئێمە) کرد ئینجا ئێمەش وەڵامان دایەوە بە دەنگیەوە هاتین خۆی و (ئیماندارانی) خێزانەکەیان ڕزگار کرد لە تەنگانە زۆر گەورەکە (لافاو و خنکاند) ن.

ئەم دوو بابەتە هەستی پێ دەکرێت و بەچاو دەبینرێت و گوێیەکانیش دەیبیستن.

---

(١) [الأنبياء: ٧٦].




# تەوحید چییەو جۆرەکانی چین؟

لە وانەی پێشوو باسی باوەڕبوونمان کرد بە الله لەم وانەیە دەبێ بزانین بەتەنها الله پەرستی (تەوحید)چییە و جۆرەکانی چین، تا لەم ڕێگەیەوە خۆمان بپارێزین لە هەڵەی بیروباوەڕ و باوەڕبوون بەالله مان پتەو بکەین و بیروباوەڕمان لەسەر بنمیچ و ئەساسێکی پتەو بنیاد بنێین و تووشی هەڵە و لادان لەئاینی پیرۆزی ئیسلام نەبین.

## تەوحید چیە؟

تەوحید بریتییە لە: بەتاك دانانی الله لەعیبادەتەکان کە ئێمە ئەنجامی دەدەین، وە بەتاك دانانی لەکردەوەکانی الله وەکو: ( دروست کردن، ڕزق و ڕۆزیدان)، وە بەتاك دانانی لەناو و سیفاتەکانیدا.





- بەتاك دانانی خوا لەعیبادەت و گوێڕایەڵی كردنیدا.

- دانپێدانان بەهەموو ئەو وەسفانەی كەخوای گەورە وەسفی نەفسی خۆی پێكردووە لەقورئانەكەیدا، یان پێغەمبەری خوا وەسفی خوای گەورەی پێكردووە لەفەرموودەكاندا.

- بەپاك دانانی خوا لەهەموو جۆرە عەیب و ناڕێكییەك.

- بە دوور گرتنی خوا لەهەموو پێكچوواندنێكی ناو و سیفەتەكانی خوا بەدروستكراوەكانییەوە.

تەوحید بناغە و ئەساسی دینە، هەموو دینی ئیسلام لەسەر تەوحید بونیاد دەنرێت، هەموو پێغەمبەران بانگەوازی خەڵكەكەیان كردووە بۆ تەوحید، هیچ كردەوە و خواپەرستییەكی وەكو نوێژ و زەكات و ڕۆژوو و حەج و كردەوەی خێری تر وەرناگیرێت بەبێ بوونی تەوحید.

تەوحیدیش تاكە ڕێگای ڕزگارییە بۆ مرۆڤایەتی، بەبەڵگەی: الله عز وجل دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلا يُظْلَمُونَ نَقِيراً﴾[١] واتە: كەسێكیش كردەوە چاكەكان جێ بەجێ بكات لە نێر یان لە مێ لە هەمان كاتدا

(١) (النساء:١٢٤)

ئەو کەسە بڕوادار بێت ئەوە ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و بچووکترین ستەمیان لێ ناکرێت هێندەی توێکڵی ناوکە خورمایەك.

وە هەرکەسێك هاوبەش و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات کردەوەکانی هەڵدەوەشێنەوە، الله تعالی دەفەرموێت: (وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ)[١] واتە: وە بە دڵنیایی ئەی محمد -صلی الله علیه وسلم - وەحیمان بۆ تۆ و بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆیش ناردووە ئەگەر شەریك بۆ خوای گەورە بڕیار بدەی ئەوە کردەوەکانت هەمووی بەتاڵ ئەبێتەوە وە لە زەرەرمەندان دەبیت، (هەر چەندە پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم - دوور بووە لە شەریك دانان، بەڵام ئەگەر پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم - شەریك بۆ خوا دابنێت کردەوەی بەتاڵ بێتەوە ئەوا ئێمە لە پێشترین و هەرەشەکە بۆ ئێمەیە).

کەواتە دەبێ بەهەموو شێوەیەك خۆمان لە هاوبەش بڕیاردان بپارێزین و الله بەتاك ڕابگرین، تا ڕەزامەندی خودا بەدەست بهێنین.

---

(١) (الزمر:٦٥)






# تەوحید چییەو جــۆرەکانی چـــین؟

## جۆرەکانی تەوحــید:

### زانایان تەوحیدیان دابەش کردۆتە سەر سێ جۆر:

**یەکەم:** یەکخواپەرستی لە پەروەردگارێتیدا:

**دووەم:** یەکخواپەرستی لە خوایەتیدا:

**سێ یەم:** یەکخواپەرستی لە ناو و سیفاتەکانی خوای گەورەدا:

## جۆری یەکەم: یەکخواپەرستی لە پەروەردگارێتیدا(التوحد الربوبیە):

### یەکخواپەرستی لە پەروەردگارێتیدا بەسێ شێوە باس دەکەین:

**یەکەم:** سەبارەت بە بەتاك دانانی خوا لە دروست کردن و بدیهێناندا:

ئەمەیان بریتیە لە بەتاك دانانی خوای گەورە لە دروستکردن و خاوەندارێتی و بەڕێوەبردندا، خوای گەورە بەتەنها خۆی بەدی

هێنەرو دروستکارە و هیچ بەدی هێنەرێکی تر نیە جگە لەو نەبێت، وەك دەفەرموێت: (هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ)[١] واتە: بزانن کە هیچ دروستکراوێکی ترتان نیە جگە لە ( اللَّه ) کە لەئاسمانەوە ڕۆزیتان دەدات بە ئاوی باران ، و لەزەویشەوە بە ئاو وکانزاکان وجگە لە مانەش . هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لە ( اللَّه ) ، تاکە وبێ هاوەڵە .

دووەم: بەتاك دانانی خوا لە خاوەنداریێتیدا: واتە خوای گەورە بەتەنها خاوەنی هەموو شتێکە وەکو دەفەرموێت: (تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)[٢] واتە: خێر و چاکەکاری خوای پەروەردگار هەمیشە زۆرە بەسەر بەدیهێنراوەکانیەوە ، ئەو خوایەی کە موڵك و دەسەڵاتی دونیا و دوارۆژ بەدەستی ئەوە ، فەرمان و بڕیارەکانی تێدا بەجێیە ، و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە

سێیەم: بەڕێـوەبردن: خوای گەورە - عزوجل- تاك وتەنهایە لە بەڕێوەبردندا و تەواوی دروستکراوەکان بەڕێوەدەبات لە ئاسمانەکان و زەویش، وەکو دەفەرموێت: (أَلا لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ

(١) (فاطر:٣)

(٢) (سورة الملك،الآية:١)

الْعَالَمِينَ)[١] واتە: بزانن كە هەموو بەدیهێنان و هەموو فەرماندانێك هەر بۆ خوایە ، پاك و بێگەرد و بەرز و گەورە بێت لە هەموو كەم و كورِیەك ، ئەو پەروەردگارەی كە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە . وە ئەم بەڕێوەبردنە گشتگیر ولەخۆگرە و هیچ شتێك نایگۆڕێت و بەرانبەری ناگرێت و ڕێگری نیە.

تێبینی/ ئەو بەڕێوەبردنەی كە بەدەست هەندێك لە دروستكراوەكانەوەیە وەكو بەڕێوەبردنی مرۆڤ ماڵ و كۆیلە و خزمەتكار و هاوشێوەكانی ئەوا بەڕێوەبردنێكی سنووردارە و ناتوانن بەبێ سنووری كارەكان بەڕێوە ببەن.

## جۆری دووەم: باوەڕبوون بە پەرستراوێتی خوا(التوحيد الالوهيه):

بریتیە لە بەتاك دانانی الله (خوا) لە پەرستشدا، ئەوەش بەوە دەبێت كە مرۆڤ هیچ شت و كەسێك لەگەڵ خوادا نەپەرستێت و لێی نزیك نەبێتەوە وەكو چۆن پەرستشی خوا دەكات و لێی نزیك دەبێتەوە.

ئەوە ئەو تەوحیدەیە كە هەموو پێغەمبەرانی پێ هاتوون و كتێبە ئاسمانیەكانی پێ دابەزیوە، زۆرترین هەڵەی خەڵكی لەسەر

(١) (سورة الأعراف، الآية:٥٤)

ئەم جۆرە تەوحیدەبووە، چونكە خەڵكی لەگەڵ خوای گەورە (بت –پەیكەر- یان مرۆڤ یان ئاژەڵ) یان پەرستییە، بەمەبەستی ئەوەی لەخوا نزیكیان بخاتەوە.

ئێمەی موسڵمان نابێ و دروست نیە نە بۆ فریشتە نە بۆ هیچ پێغەمبەرێك و پیاوچاك و خواناسێك، نەبۆ هیچ یەكێك لە دروستكراوەكان، پەرستن ئەنجام بدەین بۆ غەیری الله، چونكە خواپەرستی دروست و ڕێگەپێدراو نیە تەنها بۆ الله (خوا )نەبێت.

ئەوەی ئەم جۆرە تەوحیدەی نەبێت و گوێی پێ نەدات ئەوا هاوبەش بڕیاردەرە و بێباوەڕە، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ)[١] واتە: ئەو كەسەش لەگەڵ خوای پەروەردگاردا پەرستراوی جگە لەو بپەرستێت ئەوا خوای پەروەردگار بەهەشتی لەسەر حەرام كردووە و ئاگر دەكاتە شوێن و مەنزڵگای هەمیشەیی ، وهیچ سەرخەرێكیشی نیە تێیدا بۆ ئەوەی ڕزگاری بكات لێی.

(١) (المائدة: الآية٧٢)

## جۆری سێیەم/ باوەڕبوون بە ناو وسیفەتەکانی الله (خوا): التوحيد الأسماء و الصفات:

موسڵمانان دەبێ وەك ئەوەی خوای گەورە لەقورئان و پێغەمبەری خوا جێگیرییان کردووە لەناو و سیفاتەکانی خوا ئێمەش ئاوا جێگیری بکەین و نابێ گۆڕانکاری تێدابکەین و هاوشێوەی بۆ دابنێین.

وە دەبێت قەدەغەی ئەوانە بکەین کە الله (خوا) لەسەر خۆی قەدەغە کردووە و ئەوەی کە پێغەمبەر قەدەغەی کردووە بەکاربهێنرێ بۆخوا لە عەیب و عـارو نوقستانی.(واتە خوای گەورە هیچ کەم و کوڕییەکی نییە و کاملە).




## دووەم ڕووکنی باوەڕ:
## باوەڕبوونە بە فریشتەکان[١]

باوەڕبوون بە فریشتە دووەم پایەی باوەڕە لە ئیسلامدا، پێویستە لەسەر موسڵمان باوەڕی هەبێت بە بوونی فریشتە و بە سیفەتەکانیان وەك ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتوون.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ ﴾[٢] واتە: پێغەمبەرو ئیماندارا‌ن باوەڕیان هەیە بەوەی لە لایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی.

---

(١) پایەکانی باوەڕ.
بیروباوەڕی ئیسلامی.
سایتی تەنزیل.
الدرر السنية، الموسوعة العقدية، الكتاب الثالث: الإيمان بالملائكة.

(٢) البقرة (٢٨٥)

## فـریشـتە چـییە؟

فریشتەكان بوونەوەرێكی نادیارن، ژمارەیان زۆرە تەنها الله (خوا) ژمارەیان دەزانێت، بەندەی ڕێزلێنراون، ناخۆن و ناخۆنەوە و بێزار و هیلاك نابن، لە سیفەت و كردارياندا پاك و بێگەردن، الله (خوا) لە ڕووناكی (نور) دروستی كردوون، بەندایەتی بۆ الله (خوا) دەكەن و دەیپەرستن و هیچ تاوان و سەرپێچییەك ئەنجام نادەن و زۆر گوێڕایەڵی فەرمانەكانی الله (خوا)دەكەن.

فریشتەكان هەیانە دووباڵی هەیە یان سێ یان چوار و زیاتر، بۆ نمونە پێغەمبەری خوا دەربارەی جوبرائیل ئەفەرموێت: شەش سەد باڵی هەیە، هەروەها زۆر جار فریشتەكان خۆیان ئەخەنە سەر شێوەی پیاو یان شێوەی خۆیان ئەگۆڕن بە پێی ئەو فەرمانەی خوای گەورە داوایان لێدەكات.

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەربارەیان دەفەرموێ:- ﴿لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾﴾[١]،

واتە: (ئەو فریشتانە ئەوەندە ڕەوشت بەرزن) هەرگیز نافەرمانی ناكەن و قسە لەقسەیدا ناكەن و لە گوفتاردا پێشی ناكەون، ئەوانە بە فەرمانی ئەو دەجوڵێنەوە و فەرمانی جێبەجێ دەكەن.

(١) الانبیاء




# هەندێك لەناوەكانی فریشتە و كارەكانیان

موسڵمانان دەبێ باوەڕیان بە ناو و ئیشەكانی فریشتەكان هەبێ، ئەو ناوانەی كە لەقورئان و سوننەتدا هاتوون، وەك:

**جوبرەئیل:** سەرپەرشتیارە بەسەر سروشی (وەحی) خوا.

**میكائیل:** ڕاسپاردەكراوە بە باران و ڕووەك.

**ئیسڕافیل:** ڕاسپاردەكراوە بە فووكردن بە كەڕەنادا لەكاتی هاتنی قیامەت و زیندبوونەوەی دروستكراواندا.

**مــلك الموت:** (فریشتەی گیان كێشان): فریشتەی گیان كێشانە لە كاتی مردندا.

**مــــالك:** ڕاسپاردەكراوە بە ئاگرو بەرپرسی دۆززەخە.

**ڕەزوان:** ڕاسپێردراوە بە بەهەشت.

**نەكیر و مونكەر:** ناویان هاتووە لە فەرموودەكانی تایبەت بە پرسیارەكانی ناو گۆڕ.

هەروەها هەیانە ئەركیان پیرۆزكردنی ناوی خوا و هەڵگرتنی عەرشە.




# سێیەم ڕووکنی باوەڕ:
# باوەڕبوون بە کتێبە ئاسمانییەکان

باوەڕبوون بە کتێبە ئاسمانییەکان پایەی سێیەمی باوەڕە لە ئیسلامدا، کە پێویستە موسڵمانان باوەڕ بەهەموو ئەوکتێبانە بهێنن لەلای الله (خوا) دابەزیوە بۆ مرۆڤەکان.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ:- ( وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ (٤))[١] واتە: (لە هەمان کاتدا) ئەوانە باوەڕ دەهێنن بەو (پەیامەی) کە بۆ تۆ (ئەی محمد) دابەزێنراوە و بەو پەیامانەش کە بۆ (پێغەمبەرانی پێش تۆ) دابەزێنراوە، دڵنیاش دەبن کە ڕۆژی دوایی پێش دێت و قیامەت هەر بەرپا دەبێت.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:- ﴿إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ

---

(١) البقرة

زَبُوراً﴾[١]، واتە؛ بەڕاستی ئێمە نیگامان بۆ تۆ ناردووە هەر وەكو چۆن نیگامان بۆ نوح و پێغەمبەرانی دوای ئەو ناردووە، هەروەها نیگامان ناردووە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و (هەندێك) لە كوڕانی یەعقوب و عیسا و ئەیوب و یونس و هاروون و سولەیمان، زەبوریشمان بە داود بەخشیوە.

### باوەڕبوون بە كتێبەكان چوار بوار دەگرێتەوە:

یەكەم: باوەڕبوون بەوەی الله (خوا) دایبەزاندووە.

دووەم: باوەڕبوون بە ناوەكانیان.

سێیەم: بەڕاست دانـــانی ئەوەی ڕاســـتە لە هــەواڵەكانیان، وەك هــەواڵەكانی قورئـــان، و ئەو هــــەواڵانەش كە نەگۆڕاوون یان دەستكاری نەكراون لە كتێبەكانی پێشوو.

چوارەم: كردەوەكردن بەو حوكمانەی كە هەڵنەوەشێنراوەتەوە تیایاندا، ڕازی بوون و مل كەچبوون پێیان.

---

(١) النساء (١٦٣)




# ئەو کتێبانەی لە قورئاندا ناویان هاتووە کامانەن؟

باوەڕمان وایە اللە تعالی کۆمەڵێك کتێبی دابەزاندووە بەسەر کۆمەڵێك لە پێغەمبەرانیدا، سەرجەم کتێبەکانی پێشوو کە دابەزێنران، لەلایەن خەڵکیەوە دەستکاری دەکرا و دەگۆڕدرا، بەمەش اللە تعالی پێغەمبەری تری دەنارد و کتێبی تری دادەبەزاند، هەتاوەکو قورئان هات و کارکردنی بە سەرجەم کتێبەکانی تر هەڵوەشاندەوە و اللە تعالی بەڵێنی داوە کە خۆی دەیپارێزێت تاوەکو قیامەت و دەستکاری ناکرێت وەکو کتێبەکانی تر، هەر لەبەر ئەوە بووە کۆتا کتێبی ئاسمانی و بوو بە دینێکی جیهانی، هەر کەسێك لەسەر دینێکی تر بێت و کار بە کتێبێکی تر بکات جگە لە قورئان ئەوە بێباوەڕە، چونکە قورئان هات بۆ ئەوەی کاکردن بە کتێبەکانی پێشوو هەڵبوەشێنێتەوە بەمەش دەگوترێت (نسخ) بوونەوە.

بەڵام لەڕووی باوەڕبوونمان بە کتێبەکان، پێویستە باوەڕمان وابێت کە کتێبەکان سەرەتا بەپاکی لەلایەن اللە ـەوە دابەزێنراون،

بەڵام دواتر دەستکاری کران و شێواندران و تێکەڵ بە کوفر و بێباوەڕی کرا و خەڵکێك لەبەرژەوەندی خۆیان دینی خوای گەورەیان گۆڕی.

**بە چوار خاڵ دەزانین کە شتێکمان پێگەیشت لە کتێبەکانی پێشووتر ئایا دەستکاری کراوە یان نا:**

١/ ئەگەر پێچەوانەی تەوحید بوو و هاوبەش (شرك)ی تیابوو ئەوە دەستکاری کراوە.

٢/ تانە و تەشەر لە پێغەمبەران بدات ئەوە دەستکاری کراوە.

٣/ ئەگەر ئایەتێکی، ئایەتێکی تری بەتاڵ کردەوە وەرناگیرێ و دەستکاری کراوە.

٤/ هەر شتێك لە کتێبەکانی پێشوتر خوراِفیات بوو و لەگەڵ عەقڵی مرۆڤ و معجیزەی الله یەکی نەگرتەوە ئەوە دەستکاری کراوە.

**ئەو کتێبانەی لەقورئانی پیرۆز ناویان هاتووە:**

**یەکەم/ زەبوور:** خوای گەورە دەفەرموێت:- ﴿.. وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا﴾[1]،واتە؛ زەبوریشمان بە داود بەخشیووە.

(١) النساء (١٦٣)

**دووەم/ تەورات بۆ پێغەمبەر موسا دابەزیوە:-** خوای پەروەردگار دەفەرموێت:- ﴿ثُمَّ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ تَمَامًا عَلَى الَّذِي أَحْسَنَ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ﴾[١] ،واتە؛ پاشان کتێبی (تەورات)مان بە موسا بەخشی بۆ ئەوەی نازو نیعمەتی تەواو برێژین بەسەر ئەو کەسەدا کە بەچاکی پیادەی دەکات و جیاکەرەوە و ڕوون کەرەوەی هەموو شتێك بێت و ڕێنموویی و میهرەبانیش بێت، بۆ ئەوەی ئەوانە باوەڕی دامەزراو بهێنن بەگەیشتنەوەیان بە پەروەردگاریان.

خوای پەروەردگار لە قورئـــاندا ئامـــاژە بەوە دەکات کە (تـــەورات) دەستکاری کراوە و تێکدراوە، لەبەرئەوە جارێکی تر خوا پێغەمبەر عیسای ناردووە بۆ ڕێنمایی کردنی یەهودییەکان بۆ ڕاستیەکان جارێکی تر.

**سێیەم/ ئینجیل:** ئینجیل ئەو کتێبەیە کە الله (خوا) دایبەزاندووە بۆ مەسیح (عیسا) وەك تەواوکەرێك بۆ تەورات و، پاڵپشت کردنی و بانگەواز کردن بۆ پەرستنی خوا بە بێ هاوەڵ.

(نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ)[٢] واتە: ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خوا قورئانی

(١) الانعام ( ١٥٤)
(٢) آل عمران (٣)

بۆ تۆ بەڕاست و دروست (بە چەند قۆناغێك) دابەزاندووە، بەڕاست دانەری سەرجەم کتێبە پێشووەکانی پێش خۆیەتی (پێش دەستکاری کردنیان)، هەروەها تەوراتی بۆ (موسا) و ئینجیلی بۆ (عیسا) ڕەوانە کردووە لە پێش قورئاندا.

**چوارەم/ قورئانی پیرۆز:** قورئانی پیرۆز دوایین کتێبی ئاسمانییە لەلایەن الله(خوا) دابەزیوە بۆ پێغەمبەری خوا، لە کتێبەکانی تر درێژتر و گشتگیرترە، دەربارەی قورئان چەند ئایەتێك لە قورئاندا هاتووە: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنْ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ﴾[1]، واتە: ئێمە قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و ڕاستیەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕاستی و دروستی کتێبەکانی پێش خۆیشی دیاری دەکات و چاودێرە بەسەر هەموویاندا.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:- ﴿وَمَا كَانَ هَذَا الْقُرْآنُ أَنْ يُفْتَرَى مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ الْكِتَابِ لا رَيْبَ فِيهِ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾[2]، واتە: وەنەبێت ئەم قورئانە لەلایەن کەسێکەوە داڕێژرا بێت و هەڵبەسترا بێت جگە لەخوا، بەڵکو ڕاستی و ڕەوانی

---

(١) المائيدة (٤٨)

(٢) يونس ( ٣٧)





کتێبە ئاسمانیەکانی پێش خۆشی دووپات دەکاتەوە، هەروەها ڕوونکەرەوەی بیروباوەڕو ئەرکەکانە، بەڕاستی هیچ گومان لەوەدا نیە ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەوە ڕەوانەکراوە.

قورئان پارێزراوە لە هەر دەستکاریکردن و تێکدان و گۆڕانکارییەك و هەموو جیهانی ئیسلامی یەك نوسخەی قورئان کۆیان دەکاتەوە، تاکۆتایی دونیاش کەس ناتوانێت دەستکاری بکات یان بیگۆڕێت چونکە الله (خوا) خۆی دەیپارێزێت.




# چوارەم ڕووكنی باوەڕ:
# باوەڕبوون بە پێغەمبەران

باوەڕبوون بەپێغەمبەران پایەی چوارەمی ئیمانە، كە پێویستە موسڵمانان باوەڕ بەهەموو پێغەمبەران بكەن و بە نێردراوی ڕاستی الله(خوا)ی بزانن.

## پێغـەمـبەران كـێن؟

پێغەمبەران ئەو كەسانەن كە خوا هەڵی بژاردوون بۆ ڕێنمایی كردنی خەڵك بۆ پەرستنی خوا بە بێ دانانی هاوەڵ و هاوبەش و، بانگیان بكات بۆ چاكە و ڕەوشتە چاكەكان و وازهێنان لە بتپەرستی و قەدەغەكراوەكان.

### باوەڕبوون بە پێغەمبەران چوار بوار دەگرێتەوە:

١- باوەڕبوون بەوەی كە پەیامەكانیان حەق و ڕاستن و لای الله (خوا) وە هاتوون، ئەوەی بێباوەڕبێت بە پێغەمبەران یان هەر پێغەمبەرێك ئەوا بێباوەڕدەبێت بە هەموویان.

٢- باوەڕبوون بەهەموو ئەو پێغەمبەرانەی ناوەکانیان زانراوە، وەك:

(محمد و عیسا و مووسا و نووح و ئیبراهیم ... هتد)، هەروەها باوەڕبوون بەوانەی ناوەکانیان نەزانراوە بە گشتی، خوا لە قورئاندا دەفەرمووێت:- (وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِنْ قَبْلِكَ مِنْهُمْ مَنْ قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَنْ يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ قُضِيَ بِالْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ[١] (واتە:- بەڕاستی ئێمە پێش تۆ پێغەمبەرانی تریشمان ڕەوانە کردووە، هەیانە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتیانمان بۆ گێڕاویتەوە، هەشیانە کە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتیان بۆ نەگێڕاویتەوە.)[٣]

٣- بەڕاست دانانی هەواڵ و باسەکانیان.

٤- کردەوە کردن بە شەریعەتی دوایین پێغەمبەریان کە پێغەمبەری ئیسلامە (محەممەد)

(١) غافر ( ٧٨)




# پێغەمبەران لە قورئـانـدا

لە قورئاندا ناوی ٢٥ پێغەمبەر هاتووە، بەشێکی زۆریش ناویان نەهاتووە.

## خاوەن توانا و خۆڕاگرەکان:

خاوەن توانا و خۆڕاگرەکان (أولوا العزم)، پێنج پێغەمبەرن کە خاوەن توانان و خۆڕاگریین لەناو پێغەمبەرانی تردا، وەك لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە:- ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنْكَ وَمِنْ نُوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَأَخَذْنَا مِنْهُمْ مِيثَاقًا غَلِيظًا﴾[1] واتە:- پەیمانمان لە پێغەمبەران وەرگرتووە پەیمانی یەکخواپەرستی، پەیمانی گەیاندنی بانگەوازی خوا، بەتایبەت تۆ ئەی محمد و لە نوح و

(١) الاحزاب (٧)




ئیبراهیم و موسا و عیسای کوڕی مریەم، بێگومان پەیمانێکی بەهێز و پتەومان لێ وەرگرتن.

کەواتە پێغەمبەرە توانا و خۆڕاگرەکان بریتین لە پێنج پێغەمبەر: (نوح ـ ئیبراهیم ـ موسا ـ عیسا ـ محمد )




# پێنجەم ڕووکنی باوەڕ:
# باوەڕبوون بەڕۆژی دوایی

باوەڕبوون بەڕۆژی دوایی پایەی پێنجەمی باوەڕ (ئیمانە) و موسڵمانان دەبێ باوەڕی تەواویان هەبێ بە ڕۆژیی قیامەت یان ڕۆژی لێپرسینەوە.

ڕۆژی دوایی مرۆڤەکان دوای مردنیان زیندوو دەکرێنەوەو لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت لەسەر قسە و کردەوەکانی، جا ئەوانەی قسەی باشیان کردووە و کردەوەی باشیان کردووە خوای پەروەردگار دەیخاتە بەهەشت و هەموو خۆشییەکی پێ دەدات و دڵخۆش دەبێت، ئەگەر قسە و کردەوەی خراپی کردبێ ئەوە سزا دەدرێت لەسەری.

باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی سێ بوار دەگرێتەوە:

## یەكەم: باوەڕبوون بە زیندووبوونەوە:

ئەمەش زیندووبوونەوەی خەڵكی دەگرێتەوە بۆ لێپرسینەوە لەكردەوەكانی، وەك لە قورئاندا هاتووە:- (كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ)، واتە: هەروەك چۆن لە سەرەتاوە دروستمان كرد، وەك ئەوسای خۆی لێ دەكەینەوە، ئەوە پەیمان و بەڵێنی ئێمەیە، بێگومان ئێمە ئەو كارە ئەنجام دەدەین.

## دووەم: باوەڕبوون بە لێپرسینەوە و پاداشت وەرگرتنەوە:

ئەمەش باوەڕبوون دەگرێتەوە بەوەی كە خەڵك لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەكرێت و بە پێی كردەوەكانی خۆیان پاداشت وەرئەگرن، وەك لە قورئاندا هاتووە:- ( إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ، ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم)، واتە: بێگومان ئەوانە گەڕانەوەیان هەر بۆ لای ئێمەیە. لەوەودوایش بەڕاستی حیساب و لێپرسینەوە و دادگاییان لەسەر ئێمەیە.

## سێیەم: باوەڕبوون بە بەهەشت و ئاگر:

باوەڕبوون بە بەهـــەشت و دۆزەخ، كە بەهـــەشت مـــاڵی خۆشگوزەرانیە و خوا ئامادەی كردووە بۆ باوەڕداران و چاكەكاران، دۆزەخیش ماڵی سزایە بۆ بێباوەڕ و ستەمكاران.




# نیشـــانەکانی ڕۆژی دوایی

نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دابەش دەبن بەسەر دوو بەش، ئەوانیش نیشانە بچووکەکان و نیشانە گەورەکانن.

## یەکەم: نیشـانە بچـوکەکان:

### نیشانە بچوکەکانی قیامەت زۆرن، گرنگترینیان ئەمانەن:

- کەمبوونەوەی زانست و زۆربوونی نەفامی
- زۆربوونی کوشتنی بێ هۆکار لەناو خەڵکیدا
- زۆر بوونی بومەلەرزە و ڕۆچوونی زەوی
- بڵاوبوونەوەی خراپە و ستەم کردن
- لە دەستچوونی بەرپرسیارێتی و نەمانی پێشەوای دادپەروەر و دڵسۆز
- ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان
- بەرزبوونەوەی کۆشك و خانووەکان

- کورتبوونەوەی کات.
- بڵاوبوونەوەی گەندەڵی
- پچڕاندنی سیلەی ڕەحم
- کەمبوونەوەی پیاوچاکان و بەرزبوونەوەی بێمێشك و بێڕێزەکان.
- زۆربوون و بڵاوبوونەوەی درۆ و گەیاندنی هەواڵەکان بەبێ دڵنیایی لە ڕاستگۆیی.
- زۆربوونی شایەتیدانی درۆ
- زۆربوونی ئافرەت و کەمبوونی پیاوان
- سووکایەتی بە سوننەت و پەیامەکانی خوا.....هتد.

## دووەم: نیشانە گەورەکانی قیامەت:

**لە گرنگترین نیشانە گەورەکانی قیامەت ئەمانەی خوارەوەن؛**

- دەرکەوتنی محمدی مەهدی لە سەر زەویدا.
- گەڕانەوەی پێغەمبەر عیسا(علیه‌السلام) لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی.
- دەرچوون و سەرهەڵدانەوەی یەئجوج و مەئجوج لە سەر زەوی.
- دەرچوونی ئەو گیانلەبەرەی کە گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکی دەکات.
- ئەو ئاگرەی کە خەڵکی ڕووەو مەحشەر ڕاو دەنێت.
- سێ ڕۆچوونی گەورە لەسەر زەوی ڕوو دەدەن.
- دەرکەوتنی دەجالی گەورە کە بانگەشەی خوایەتی دەکات.




# شەشەم ڕووکنی باوەڕ:
# باوەڕبوون بە قەزاو قەدەر

باوەڕبوون بە قــەزا و قــەدەر پایەی شەشەمە لە پـــایەکانی بـــاوەڕ لە ئیسلامدا، و باوەڕ بە بێ ئەو تەواو نابێت.

## قــەزا و قــەدەر چـییە؟

**قەزاو قەدەر:** بریتیە لە زانستی اللـــــه (خـــوا) بەشتەکان و نوسینیان پێش ئەوەی ببن، لەسەر ئەو شێوەی کەهەن، وەك لە قورئاندا هاتووە:- (ما أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ، لِكَيْلا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ)، واتە؛ هیچ بەڵاو ڕوداوێك لەزەویدا، بۆتان پێش نەهاتووەکەلە_ لوح المحفوظ _ دا تۆمارمان نەکردبێت، پێش ئەوەی ڕووداوەکەپێش بێت، ئەو کارەش بۆ خوا زۆر ئاسانە، ئەمەش بۆ ئەوەی کەخەفەت نەخۆن بۆ

ئەوەی لەکیستان چووەو بەوەش دڵخۆش و غەڕڕا نەبن کەپێیان بەخشیوون، چونکەخوا کەسانی خۆ بەگەورەزان و فەخرفرۆشی خۆش ناوێت.

قەزاوقەدەر ئەو شتەیە کە لەتوانای مرۆڤ بەدەرە و ناتوانێت کۆنترۆڵی بکات وەك ڕووداني بوومەلەرزە و گەردەلوول و هاوشێوەی ئەوانە.




# بەڵگەکانی قورئان و سوننەت دەربارەی قەزاو قەدەر چین؟

**ئەو بەڵگانـەی لە قورئـــان و سوننەتدا هاتوون دەربارەی قەزاو قەدەر چوار بوار دەگرێتەوە:**

**یەکەم:** باوەڕهێنان بەوەی خوا زانستی بەهەموو شتێك هەیە بەداهاتوو و ڕابردوو، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ﴾ واتە: خوای گەورە بە هەموو شتێك زانایە.

**دووەم:** باوەڕهێنان بەوەی هەرچی ڕووی داوەو ڕوودەدات خوای گەورە هەمووی لە کتێبێکدا نووسیوە بەناوی (لوح المحفوظ) ئەمەش (٥٠) هەزار ساڵ پێش دروست بوونی بوونەوەر و گەردوون، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَكُلُّ شَيۡءٖ فَعَلُوهُ فِي ٱلزُّبُرِ ۝ وَكُلُّ صَغِيرٖ وَكَبِيرٖ مُّسۡتَطَرٌ﴾ واتە: هەرچی کارو کردەوەیەك کەئەنجامیان داوەلە (لوح المحفوظ) و لەلای فریشتەچاودێرەکان تۆمارکراوە، وە هەرچی وردو درشت هەیە، لەکارو کردەوەیان نووسراوەو تۆمارکراوە.

**سێیەم:** باوەڕهێنان بەوەی هەرچی ڕوودەدات لەبوونەوەردا هەموو لەژێر فەرمان و قەدەری خوا دایە، لەدروست کردوون و جووڵە و مردن و ژیان و...هتد.هەموو شتێك هەر بۆلای ئەو دەگەڕێتەوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ : {وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُ ٱلۡأَمۡرُ كُلُّهُۥ} واتە: هەموو کارو فەرمانیش هەر بۆ لای ئەو زاتەدەگەڕێتەوە.

**چوارەم:** باوەڕهێنان بەوەی خوا هەموو بوونەوەری دروست کردووە، خوای گەورە دەفەرموێت : { ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٍ} واتـــە: خـــوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە.



# لە کۆتاییدا

پایەکانی ئیمانیشمان تەواوکرد و خۆمان فێری کرد ئیتر لەمەودوا دەبێ کار بەو زانستەبکەین و هاوڕێ کانیشمان فێربکەین و وانەکانی ئیمان و ئیسلامیان بۆ باس بکەین.

داواکارم لە خوای گەورە لەهەموو ڕێگایەکی خراپ و لار بمانپارێزێت و هەموومان شارەزا بکات لەدینەکەی و لەسەر ڕێگای ڕاست و دروست بەردەوامیان پێ ببەخشێ و لەبەهەشتەکەی بەهرەوەرمان بکات و بە بینینی خۆی شادمان بکات. آمین.

سالار عومەر

٢٠٢٢/٤/١٦

# سەرچاوەکان


- سایتی تەنزیل
- باوەڕبوون بە کتێبەکان، سایتی فەرموودە.
- http://www.islamhouse.com/
- http://www.islamhouse.com1http://www.islamhouse.com3
- "مفهوم النبوة في الإسلام - موقع مقالات إسلام ". www.islamweb.net.
- "تعريف النبي والرسول". www.alukah.net
- "المبحث الأول: معنى الإيمان بالرسل". dorar.net
- "معنى الإيمان بالرسل". www.alukah.net
- قورئانی پیرۆز
- سایتی تەنزیل
- سایتی دەنگی ئیسلام
- سایتی سێبەر
- باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی

# نـــاوەڕۆك